

# سێ هاورێکە



وەرگێڕانی لەفەڕەنسیەوە

زریان مەحمود

2016



به سپۆنسەری

ڕاسان
RASAN Group

# سێ هاوڕێکە

## بەرهەمێك بۆ منداڵە چاوگەشەکان

وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە

زریان محمود

٢٠١٦

# سێ هاوڕێکە

## بەرهەمێك بۆ منداڵە چاوگەشەکان

ناوی کتێب: سێ هاوڕێکە

وەرگێڕانی لە فەرەنسیەوە: زریان مەحموود

نۆبەی چاپ: یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠١٦ ز - ١٤٣٧ ك

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانە: پیرەمێرد

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی «١٢٩١»ی ساڵی «٢٠١٦»ی پێدراوە.

## پێشەکی

وەرگێــڕان، یەکێکە لــە هۆکارو ڕێــکارە کاریگەرەکان، بــۆ تێکەڵاوکردنو ئاوێزانبوونی کەلتووری هەموو نەتەوە جیاوازەکانی دنیا. دەتوانین بڵێین: بە تۆکمەترین پردی بەستنەوەو پەیوەندیی نێوان میللەتانی جیهان دادەنرێت.

بەشێوەیەك ئەگەر لەڕێگەی وەرگێڕانو فێربوونی زمانی بێگانەوە نەبێت، هیــچ میللەتێــك ناتوانێت لە زمــانو فەرهەنگی میللەتێکی تــر تێ بگات، با دووریــی پێگەی جوگرافیی ئــەو دوو میللەتەش، تەنها چەنــد کیلۆمەترێك، ســنووری جیاکردنەوەیان بێت، بەڵام بەهــۆی وەرگێڕانەوە، دەتوانرێت مەودا دوورەکان نزیك بکرێنەوەو کەلتوورە جیاوازەکان ئاشنای یەکتر بکرێن. ئەوەی کە لێرەدا مەبەســتمانە تیشکی بخەینە ســەر، وەرگێڕانی چیرۆکی منداڵانە. ئەم بەرهەمەی بەردەســتتان، کارێکی بچــووكو ئەزموونێکی نوێیە لە بواری وەرگێڕانی چیرۆکی منداڵان لە زمانی فەڕەنســییەوە، بۆســەر زمانی کوردی. لە ڕوانگەی هەســتکردنمان بە پێویستیی ئەدەبیاتی کورد بە کاری وەرگێڕانو هێنانە نــاوەوەی ئەدەبیاتی نەتەوەکانی تر، هەوڵمان دا کارێك بکەین. زمانی فەڕەنســی - هەتــا ئێســتاش - بۆ کۆمەڵــگای کوردی زۆر نامۆیــە، هەروەها ئەدەبیــاتو خوێنــەری کوردیش، پێویســتیان بــە تێگەیشــتنو خوێندنەوەو تێکەڵاوبوون بە ئەدەبوو فەلســەفەی فەڕەنسی هەیە، ئەمەش تەنها لە ڕێگای وەرگێڕانەوە دەکرێت.

هیــوادارم ئەم بەرهەمــە بچووکە، هۆکارێك بێت بۆ ئاشــناکردنی چیرۆکی فەڕەنســی بە خەیاڵو چاوی منداڵانی ئەزیزی کوردســتانو تێبگــەن کــە چ جیــاوازیو لێکچوونێــك هەیە لە نێــوان حیکایەتو گێڕانەوە فۆلکلۆرییە کوردیو فەڕەنسییەکاندا.

وەرگێڕ ٢٠١٦/٣/٣



لەناو دارســـتانێکدا، لەژوورێکی بچووکدا، سێ هاوڕێ وەکوو برا پێکەوە دەژیان. چۆلەکەیەك، مشکێك، بۆقێك.

ئەم ســـێ هاوڕێیـــە، بەبەردەوامی لـــە هاوکاریکردنی یەکدیدا بـــوونو بەبێ جیاوازی، کاریان دەکـــرد. چۆلەکەکە دەچوو دەگەڕا بەدوای خۆراکدا، مشـــکەکەش ئاوی دەهێنـــاو بۆقەکەش خواردنی درووست دەکرد.

کات هـــەر بـــەو شـــێوەیە تێدەپـــەڕی. . . ئێوارەیـــەك کاتێـــك چۆلەکەکـــە بەنـــاو کێلگەکانـــدا، بـــۆ خـــواردن دەگـــەڕا، هەردوو پێیەکانی لەسەرمادا ڕەق بووبوون. کە گەڕایەوە بۆ ماڵە خۆشو گەرمەکەیان، پشوویەکیدا. مشکەکە بەپەلە مێزی نان خواردنەکەی دانا، بۆقەکەش مەنجەڵی ســـووپەکەی هێنا. چ سووپێکە! خەست، چەورو بۆنخۆش.

چۆلەکەکە گوتی: ســووپێکی چەند خۆشە! پاشای دارستانیش هەفتــەی جارێك، ئەم ســووپەی دەســت ناکەوێــت، کەچی ئێمە، هەموو ئێوارەیەك دەیخۆین.

بۆقەکــە گوتی: ئــەوە لەبەرئەوە هێندە خۆشــە، بە دەســتی وەســتای شــارەزاو کارامەی وەك من لێنراوە هههــە. فەرموون، با پێکەوە نۆشی بکەین.

مشکەکەش گوتی: منیش ئاوەکەم گەرم کرد؛ تا باش بکوڵێتو تامی سووپەکە خۆشتر ببێت.

چۆلەکەکەش گوتی: پێویســتە ئەوەش بزانین کە ئەو ســووپە لە چی درووســت کراوە. دیارە کە هەموو شــتەکانی ناویشــی من هێناومن لە دارستان... قارچکێك، دەنکە جۆیەك، دوو گەڵا کەلەرم، سێ دەنکە جۆ، ئەوانەن کە سووپێکی خۆشو دەوڵەمەند درووست دەکەن.

هەرســێکیان پێکەوە دەیانگوت: وای. . . چ ســووپێکی خۆشە!! باش درووست کراوە، باش کوڵێنراوە، باش ئامادە کراوە، فەرموون.

لە ڕاســتیدا ســێ هاوڕێکە، هەروا بەخۆشیو بەبێ زویربوونو نارەحەتی پێکەوە دەژیان.

تــا ئــەو ڕۆژەی ڕێوییەك بــەو نزیکانەدا تێپــەڕی. ڕێوییەکە لەپەنجەرەکــەوە بۆقەکــەی بینــی، کــە لە سەرســووچێکی لای ئاگردانەکەدا دانیشتبوو. جوانو خڕ، بەتام!

ڕێوییەکە نێچیرێکی باشــی دەســت کەوتبوو، بەڵام خۆ بۆقەکە هەرگیز نەدەهاتە دەرەوەو دەرگاکەشی داخرابوو. لەبەرئەوە ڕێوییە فێڵبازەکە ڕۆشت بۆ دارستانەکە، بۆ دۆزینەوەی چۆلەکەکە.

ڕێوییەکە ڕۆیشتە لای چۆلەکەکەو دەستی کرد بە کرووزانەوە: هاوڕێ هەژارەکەم! دڵم خەریکە پارەپارە دەبێت بۆت، تۆ خەریکە لە کارکــردنو ماندوویێتیدا لەناو دەچیــت، لەکاتێکدا هاوڕێکانت هیچ کارێك ناکەن.

چۆلەکەکە بەسەرســامییەوە پرسیاری کرد: چۆن؟ هیچ کارێك ناکەن؟ بەڵام ئەوانیش، هەروەك من کار دەکەن.

ڕێوییەکــە گوتــی: ئەوە چ کارکردنێکــە؟ هێنانی کووپێك ئاو، دانانی ســـووپێك لەسەر ئاگر، ئەوان هێندەی قسەکردنێك ماندوو نابــن! تۆش بە درێژایی ڕۆژ بەنــاو کێڵگەو ئاوەکاندا دەگەڕێیت!. مــن دەمەوێت ئەوە بزانیت، ئەو کارەی کە بۆقەکەو مشــکەکە دەیکەن ئاسانەو هیچ مەترسییەکی نییە.

دوای تەواوکردنــی قســەکانی، ڕێوییەکــە ڕۆیشــت. چۆلەکەکەش بەتەنهــا لەوێ مایــەوەو کەوتە بیرکردنەوە لە قســەکانی ڕێوییەکە. ئەوە یەکەم جار بوو کە لەبارەی ڕاســتییەکی هەمیشــەییەوە قسەی بۆکرابوو.

چۆلەکەکــە لە دڵــی خۆیدا گوتی: کاتێك بیــر دەکەمەوە، خۆ قسەکانی ڕێوییەکەش ڕاستن. ئەوە منم کە هەموو کارەکان دەکەم.

دەبێت بیگۆڕم، نابێ دوای بخەم، تا درەنگ نەبووە.

چۆلەکەکـــە گەڕایـــەوە ماڵـــەوە، زۆرتووڕەبـــوو، پێیەکانی دان بەزەویـــداو هاوارێکی کردو گوتی: دەبێـــت بەیانی بۆقەکە بڕوات بۆ خواردن پەیداکردن، مشـــکەکەش خواردن درووســـت بکات. ئەم ماوەیە من زۆر لە زەحمەتدا بووم. هەر من کارم کردووە...

ڕۆژی دواتر، بۆقەکە ڕۆشت بۆپەیداکردنی خواردن، سەبەتەیەك قارچکـــی هێنابوویـــەوە، بـــەڵام لە ڕێـــگادا ڕێوییەکـــە پەلاماری داو ئازارێکـــی زۆری پـــێ گەیانـــدو قارچکەکەشـــی ڕژاند؛ چونکە نەیدەتوانی ڕابکات.

چۆلەکەکەش ڕۆشت بۆ ئاو، بەڵام هەرچەندی کرد، نەیدەتوانی بە دەنووکی ئاوەکە هەڵبگرێت. کاتێك کە ویستی ئاوەکە هەڵبگرێت، دەنووکی بەر بەردێك کەوتو شـــکا. لە بەرئەوە زۆر دڵتەنگ بوو دەستی کرد بە گریان.

مشـــکەکەش خەریکی درووستکردنی ســـووپەکە بوو. دەیویست ببێتە سووپێکی چەورو بۆنخۆش، بەڵام نەیدەتوانی. لەبەرخۆیەوە گوتی: باشـــە پێشـــتر بۆقەکە چۆنچۆنی درووستی دەکرد؟ دەبێت منیش هەوڵ بدەم وەکو ئەو سوپێکی خۆشو بەتام، چەوروخۆش دروست بکەم!

لەکاتی تێکەڵدانی سوپەکەدا مشکەکە کەوتە ناو مەنجەڵەکەوە، بەڵام هەموو لەشـــی ســـووتا. دوای ماوەیەك بە هەرشێوەیەك بوو

هاتەدەرەوە. لەســەرقەراغی لای دەرگاكە دانیشــت. هەموو لەشــی هەڵئاوساو دەلەرزی.

بۆقەكەش لەولاوە بە شەلەشــەل هاتەوە. كە هاوڕێكانیی بینی، چۆلەكەكە دەنووكی شــكابوو، مشــكەكەش هەموو پێســتی لەشی ســووتابوو. زۆردڵتەنگ بوو بۆیان. لەبەرئەوە ئەوە هەرســێكیان دەستیان كرد بە گریان.

بۆقەكــە گوتی: ئێمە پێكەوە جوانین، بۆچی وەكو پێشــترمان لێ نەیەتەوە؟

لەو كاتەدا چۆلەكەكە لە شــەرمەزاریدا سەری داخست؛ چونكە هــۆكاری ئەو نەهامەتییە ئەو بوو، بــە گوێی ڕێوییە فێڵبازەكەی كرد، بەڵام دوو هاوڕێكەی دیكەی دڵیان دەدایەوە.

ئیدی لەو ڕۆژەوە، سێ هاوڕێكە بڕیاریان دا، وەكو جاران بژینو بەقسەی هیچ بەدو ناحەزێك نەكەن. چۆلەكەكە دەچوو بۆخواردن پەیداكــردنو بۆقەكەش خواردنی درووســت دەكردو مشــكەكەش ئاوی دەهێنا.





# شێرو پیاوەکە

پیرەشێرێك، سەردانی ئاژەڵەکانی دارستانەکەی کردو نەڕاندی:

لەم دارستانەدا، هیچ کەسێك هێندەی من، بەهێز نییە!

پیرەورچێکیش کە پێشـــتر گاوانێـــك بە گۆپاڵەکەی لێی دابوو، شەلی کردبوو، بە شێرەکەی گوت:

خۆت هەڵمەکێشە، یەکێك هەیە، لە تۆ پاڵەوانترە.

شێرەکە بازێکی داو ددانەکانی جیڕ کردەوەو گوتی:

دەی پێم بڵێ، ئەو کەسە کێیە؟

ورچەکە گوتی: ئەوە مرۆڤە.

شێرەکە دیسانەوە خۆی گرژ کردەوەو گوتی:

دەی لەکوێیە؟ دەمەوێ بیبینم، هێزی خۆمی پێ تاقی بکەمەوە.

ورچەکە گوتی: برۆ بۆ ئەو دەشتاییە، لەوێ دەیدۆزیتەوە.

شێرەکە بەپەلە، دارستانەکەی بەجێ هێشتو لە دەشتاییەکەدا، دەستی کرد بەگەڕان.

لەناکاو لە مێرگێکدا، ئەسـپێکی بینی کە دەلەوەڕی. ئەسپەکە بەزنجیرێك بەسترابوویەوە. شێرەکە بە تووڕەییەوە لە ئەسپەکە نزیك بوویەوەو گوتی:

هێی، گیاخۆر، تۆ کێیت؟

ئەسپەکەش وەڵامی دایەوەو گوتی: خۆ دەبینی، ئەسپم.

شێرەکە پرسیی:

ئێ، کێ تۆی بەستووەتەوە؟

ئەسپەکە گوتی: مرۆڤ

شێرەکە پرسیی: ئەو مرۆڤە لە کوێیە؟

ئەسپەکە گوتی:

چۆتە ناو دارستانەکە؛ تا دار بهێنێت.

شـێرەکە بەرێـگای خۆیدا، بـەرەو دارسـتانەکە گەڕایەوەو لە ناوەندی دەشـتاییەکەدا، دوو گاجووتی بینی، کە بە هەوجارێکەوە بەسترابوونەوەو لەو کاتەدا. بۆ پشوودان وەستابوون.

شێرەکە لێی پرسین: هێی ئێوە کێن؟

وەڵامیان دایەوە: ئێمە گاجووتین.

شێرەکە پرسییەوە: چی دەکەن؟

گاجووتەکان گوتیان: جووتمان پێ کراوەو زەویمان کێڵاوە. ئێستاش خەریکین پشوو دەدەین.

شێرەکە گوتی: کێ ئێوەی بەستووە بەو هەوجارەوە؟

گاجووتەکان گوتیان: مرۆڤ.

شێرەکە لەبەر خۆیەوە گوتی: بۆئەوەی کە لەگەڵ مرۆڤدا ڕووبەڕوو ببمەوە دەبێت زۆر بەهێز بم؛ چونکە ئەو بەڕاستی زۆرئازا دیارە.

شێرەکە لە گاجووتەکانی پرسی:

ئەو مرۆڤە لە کوێیە؟

گاجووتەکان وەڵامیان دایەوە:

ئەوەتا لەپشت ئەو دارانەوەیە. خەریکی هەڵکەندنی چاڵە بۆ ڕاوکردنی ئاژەڵەکانی دارستان.

لەو کاتەدا کە پیاوەکە چاڵەکە بەتەواوی هەڵکەندبوو، بەلقو گەڵای دار دای پۆشیبوو. شێرەکە هاواری کردو پیاوەکەش ڕاچڵەکیو بەترسەوە، ئاوڕی لەشێرەکە دایەوە. لە بەرخۆیەوە گوتی:

ئەی هاوار، شێر! چی بکەم؟

بە هەموو لایەکدا دەیڕوانی؛ بۆئەوەی بزانێت کەسێك نییە، بەهاوارییەوە بێتو ڕزگاری بکات، بەڵام کەسی نەبینیو تێگەشت کە ناتوانێت بەسەر ئەو ئاژەڵە دڕندەیەدا زاڵ ببێت. بۆیە بڕیاری

دا، کــه دەبێت لەو وریاتــرو فێڵبازتر بێت. هاواری کرد بەســەر شێرەکەدا:

چیت لە من دەوێت؟

شێرەکە گوتی:

دەمەوێت زۆرانبازی بکەینو بزانم کاممان بەهێزترین.

پیاوەکەش گوتی:

باشە، بەڵام با یەکەم جار بزانین، کاممان چاکتر باز دەدات.

شێرەکە گوتی:

باشە. تۆ باز بدە.

پیاوەکــە دوور کەوتەوەو هێزی دایە بەر خۆیو بازی دا، بەڵام لەبەرئــەوەی پێشــتر دیاریی کردبــوو نەکەوتە نــاو چاڵەکەوەو لەوبەری چاڵەکەدا وەستاو بەشێرەکەی گوت:

ئێستا سەرەی تۆیە!

شێرەکەش هێزی دایە بەرخۆیو بازی دا، بەڵام کەوتە ناوەڕاستی چاڵە داپۆشراوەکە.

ئیدی پیاوەکە، شێری پاشای دارستانی کوشتو لە پێستەکەشی جووتێك پێڵاوی چاکی درووست کرد بۆخۆی.

کەواتــە: مرۆڤ لە هەمــوو گیانــەوەرەکان بەهێزترە؛ چونکە عەقڵو ژیرییەکی بێشوماری پێ بەخشراوە. . .



# ماسییەکی سوور

ئێوارەیەك لــە كاتی گەڕانەوەیدا لە قوتابخانــە، كوڕێكی بچووك، سوورەماســییەكی لە بازاڕ كڕی. هەر كە گەیشــتەوە ماڵەوە، خستییە ناو حەوزێكی ترەوەو لەســەر مێزێــك دای نا، كە زۆر دوور نەبوو لە قەفەسی كەنارییەكەوە.

سوورەماســییەكە دڵخۆش بــوو، لە ناوحەوزەكەیــداو لە ماڵی كوڕەبچووكەكەدا؛ چونكە خێزانێكی پەیدا كردبوو.

كەنارییەكــە، لەنــاو قەفەســەكەیدا گۆرانــی بــۆ دەگــوت. سوورەماسییەكەش بە درێژایی ڕۆژ دەسووڕایەوە لە ناوحەوزەكەیدا،

ئەوەش خۆشی دەدا بەسوورەماسییەکە.

بەڵام ڕۆژێکیان. . .

ڕۆژێکیان، پشیلەیەکی هەژاری بێلانە، کە هیچ کەسێکی نەبوو، گوێی لە گۆرانی کەنارییەکە بوو. ئەم پشیلەیە بەوێڵی لەسەر پاسارەکانی خانووە گەورەکەی کوڕە بچووکەکە دەژیا. لە بەرئەوەی کە کەس خۆراکی پێ نەدەدا، هەمیشە برسیی بوو. ئەو ڕۆژە کوڕە بچووکەکە، لە کاتی ڕۆشتنیدا، پەنجەرەکەی بەکراوەیی بەجێ هێشتبوو، بەوەش پشیلەکە گوێی لە گۆرانی کەنارییەکە بوو.

کەنارییەکەو سوورەماسییەکە بەتەنها بوون، گۆرانی کەنارییەکە بە پەنجەرەکەدا، چوویە دەرەوەو لە هەموو ماڵەکەدا دەنگی دایەوە.

پشیلەکەش لەسەر پاسارەکە، بە غەمبارییەوە گوێی لە گۆرانییەکە بوو. دەستی کرد بە بیرکردنەوە لەو کارە ترسناکەی کە دەیویست ئەنجامی بدات. ئیتر کێ ڕزگاری دەبێت لە دەستی پشیلەیەکی برسی: «کەنارییەك! هەر ئێستا دەیخۆم». پشیلەکە لەدڵی خۆیدا گوتی.

پاشان بەهێواشی دابەزییە خوارەوە بۆ لای پەنجەرەی ژوورەکە. کەنارییەکە گۆرانی دەگوت:

«من گۆرانی دەڵێم؛ چونکە لەپەنجەرەکەوە خۆر هاتۆتە ژوورەوە؛ چونکە پوولەکە بریقەدارەکانی سوورەماسیی هاوڕێم

دەدرەوشێنەوە لە بەرخۆرەکەدا؛ چونکە بەم زوانە کورە بچووکەکە لـە قوتابخانــەوە دەگەڕێتــەوە، لەبەرئەوەی ئێمە هەرســێکمان دڵخۆشین لە ژوورەکەماندا، لە قەفەسەکەماندا، لە حەوزەکەماندا».

بەڵام لەم کاتەدا، پشیلەکە گەشتبووە لای پەنجەرەکە. لەهەمان کاتدا، سوورەماسییەکە، کە نەیدەتوانی گۆرانی بڵێ، بەڵام دەیویست شتێکی شایســتە پێشکەشــی کەنارییەکە بکات، بۆ گۆرانییەکەی. لەبەرئەوە بەردەوام دەهاتە ســەر ڕووی ئاوەکەو ســەمای دەکرد. بەهەمــوو هێزییــەوە، لەســەر ڕووی ئاوەکــە وەکــوو پاڵەوانێك دەسووڕایەوە، زۆر بە زانایانە دووبارە دەڕۆشتەوە ژێر ئاوەکە.

کەنارییەکــە هەرجارەو بە ئاوازێك بانگی سوورەماســییەکەی دەکردو بە هەردووکیانەوەو بە ســەمای سوورەماسییەکەو گۆرانی کەنارییەکە، بالێیەکیان سازکردبوو.

کەنارییەکــە جــار لــەدوای جــار بەرزتــر گۆرانــی دەگوتو سوورەماســییە لە خۆباییەکەش، تا دەهات زیاتر بەرز دەبوویەوە. هێنــدە بەرز بوویــەوە، تــا لەکۆتاییدا جووڵەکەی خــراپ کردو بەلایەکی حەوزەکەدا، کەوتەخوارەوەو کەوتە سەرمێزەکە.

کاتێ کەنارییەکە ســەیری سوورەماســییەکەی کرد، کەلەســەر مێزەکە، خۆی پێچ دەدا لەناو دڵۆپەئاوێکی بچووکداو خەریك بوو بمرێت، ئیتر گۆرانی نەوت.

کەنارییەکـــە نائومێد بـــوو؛ لەبەرئەوەی لەناو قەفەســـەکەیدا بەنـــد بوو، نەیدەتوانی هیچ بکات بـــۆ هاوڕێکەی کە خەریك بوو بمرێـــت، جگە لە بێدەنگیو غەمباریو دەنگێکی بچووکی خنکاوی سوورەماسییەکە، هیچی تر، لە ژوورەکەدا نەدەبیسترا.

دوای کەمێك گوێی لە جیرەجیرێك بوو، کە دەنگی پەنجەرەکە بـــوو کرایـــەوە. کەنارییەکـــە ڕووی وەرگێڕا. چی بینـــی، . . . ئای خودایە، پشـــیلەیەکی بینی! بە یەك باز هاتبووە ســـەر قەفەزەکە. کەنارییەکە لەبەرخۆیەوە گوتی:

«خودایە، سوورەماسییەکە ون بووە!».

پشـــیلەکە سوورەماســـییەکەی نەبینـــیو بە نێـــوان تەلەکانی قەفەســـەکەدا چنگـــی بردە ناو، بـــۆ کەنارییەکـــە. کەنارییەکەش لـــە پێناو ژیانیـــدا، جەنگاو لە پشـــیلەکە خێراتربوو. پشـــیلەکە تووڕەبوو؛ چونکە کەنارییەکە لێی هەڵدەهات. کەنارییەکە وەکوو شـــێتێك بەدەم ئەمســـەرو ئەوســـەرکردنەوە، لەناو قەفەسەکەیدا بیـــری دەکردەوە: «ئەگەر بتوانم بەرگری بکەم، تا ئەو کاتەی کە قوتابییەکان دەگەڕێنەوە لە قوتابخانەوە، ئەگەر سوورەماسییەکە نەخنکێت، تا کوڕە بچووکەکە دێتەوە، ڕزگارمان دەبێت».

کـــوڕە بچووکەکە گەڕایەوە لە قوتابخانە. هەرچەندە دواکەوت، بەڵام ئایا پێش ئەوەی زۆر درەنگ بکات، فریا دەکەوێت؟

پشـــیلەکە لێوەکانـــی ئەلێســـایەوە، بـــەدەم ســـەیرکردنی کەنارییەکەوە، کە خەریك بوو لە هەناســـەدان دەکەوتو دەلەرزی لەناو قەفەسەکەیدا.

پشیلەکە دەیگوت:

«باڵندەی لەخۆبایی، هەرئێستا تەواوت دەکەم».

لەناکاو پشیلەکە لەلایەکی تری قەفەسەکەوە، سوورەماسییەکەی بینی. ئەوەش ژەمێك بوو بۆی. ڕۆشتە سەر مێزەکە. کە پشیلەکە گەشـــتە لای، سوورەماسییەکە خەریك بوو دەمرد. تەنانەت توانای جووڵەشی نەمابوو. پشیلەکە هەڵی گرتو خستییە نێوان دانەکانی.

کەنارییەکەش هێزێکی بە بەرخۆی هێنایەوەو دەســـتی کردەوە بەگۆرانیگوتن، بە شێوازێکی زۆر جوانو تامەزرۆییانە، وەك ئەوەی کە تائێستا، گۆرانی نەوتبێت.

گۆرانییەکەی هەموو ژوورەکەی گرتەوەو بەپەنجەرەکەدا چووە دەرەوە، بە هەموو ماڵەکەدا دەنگی دایەوە، خەریك بوو دەگەشـــت بە ئاســـمان. لەو کاتەشـــدا پشیلەکە، ســـکی خاڵی بوو، برسی بوو.

کەنارییەکە بەم شێوەیە گۆرانیی دەگوت:

«ئەی پشیلە، بە یارمەتیی خۆت، سوورەماسییەکە مەخۆ، هاوڕێکەمـــان مەخۆ، ئەگەر بیشـــیخۆی خـــۆ بەهێز نابیت؛ چونکە هێشـــتا گەورە نەبووەو ســـبەی تۆش هەر برســـیتە.

هەروەهـــا ئێمـــەش هەتاهەتایـــە، بۆ مردنـــی هاوڕێکەمانو پوولەکە درەوشاوەکانی دەگرین».

لەبەرئـــەوە پشـــیلەکە، پشـــیلە بێلانەکە، پشـــیلە وێڵەکە، ئەو پشیلەیەی کە برسیی بوو، بیری کردەوە، کە ناتوانێت کارێك بکات، ببێت بەهۆی ئازاردانی دەوروبەرەکەیو ویســـتی دڵخۆشیان بکات. زۆر بەهێواشـــی سوورەماســـییەکەی گەڕاندەوە بۆ ناو حەوزەکەی، بەشـــێوەیەك کە دانەکانی ئازاری نەدەن. . . سوورەماســـییەکەش دەســـتی کردەوە بەهەناســـەدانو کـــوڕە بچووکەکـــەش دەرگاکەی کردەوە، بەڵام پشیلەکە پێشتر ڕۆشتبووە دەرەوە بە پەنجەرەکەدا. کەنارییەکەو سوورەماســـییەکەش نەیاندەتوانی هیچ بگێڕنەوە بۆ کوڕەبچووکەکە، کە چی ڕووی داوە. پشـــیلە هەژارەکەش ڕۆشتەوە سەر پاسارەکانو بەردەوام برسیی بوو.

پشـــیلەکە ئیتر بەتەنها نەبوو. ئەو لە کاتێکدا کەزۆر سەرمای بوو، برســـی بوو، کوڕە بچووکەکە لـــە قوتابخانەبوو، وەکوو دزێك ڕۆشتە ژوورەوە بەپەنجەرەکەدا، بەڵام ئەو تەنها کەمێك هاوڕێیەتی دزی. . . هەمـــوو جارێ کە کوڕە بچووکەکە لەماڵ نەبوو، دەچووە ژوورەوەو دەڕۆشـــتە ســـەرمێزەکە، لەلای حەوزی ماسییەکەدا پاڵ دەکەوتو کەنارییەکە گۆرانی بۆ دەگوتن. بەو شـــێوەیە چاوەکانی دەنووقاندو خەوی لێ دەکەوت.



# گوێچکەماسییە بچووکەکە

گوێچکەماسییەکی بچووک، دوای وشکبوونی ئاوی جۆگەلەکە، هەر لە سەر ڕێگای گوندەکەدا مابوویەوەو بەتەنها دەژیا. دوای ئەوەی کە کەمێك گەورە بوو، هەستی کرد کە مەترسی زیاتری لەسەرە؛ چونکە قەبارەی گەورەتر بووەو ئاسانتر دەبینرێت. هەمیشە لە خەمی ئەوەدا بوو، لە لایەن منداڵانو ڕێبوارەکانەوە ئازارو زیانی پێ بگەیەنرێت. . لەبەرخۆیەوە گوتی: «بەداخەوە، کە من گوێچکە ماسیم. من چۆن بتوانم بڕۆمەوە بۆ ژینگەکەی خۆمو لێرە ڕزگارم ببێت؟!»

بەردەوام لە چاوەڕوانیی هەڵکەوتنی دەرفەتێکدا بوو، بەڵام هەموو ڕۆژێك پێشوازی لە هەڵهاتنی خۆر دەکردو ماڵئاوایی لە

ئاوابوونی خۆریش دەکرد، بەبێئەوەی کە بتوانێت هیچ بکات. . لە بەرخۆیـــەوە گوتی: «بەدبەختییەکەی من لەوەدایە، کە نە وەکوو ســەگو پشــیلەو ڕێوییەکان دەســتو پێم هەیە؛ تا پێی ڕابکەمو نەوەکوو باڵندەو کەناریو پەپوولەکان باڵم هەیە؛ تا پەرواز بکەم بۆ ئەو جێگایەی کە پێم خۆشە. من وەکو گەڵا هەڵوەریوەکانیش، سووك نیم؛ کە با بمبات لەگەڵ خۆیدا. . چی بکەم؟»

لەبەرئـــەوە بە نائومێدییەوە هەر لە جێـــگای خۆیدا مایەوەو کەوتە بیرکردنەوە. . بیری کردەوەو ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە، هەتا لە کۆتاییدا بیرۆکەیەکی بۆ هات: «ئەوەتا، دۆزیمەوە. . ئەگەر بتوانم خۆم ســافو لووس بکەمو بەباشیش خۆم خڕ بکەمەوە، با یارمەتیم دەداتو لەگەڵ خۆیدا هەڵم دەگرێت، هەتا دەڕۆمە سەر گردەکەو لەوێش خۆم بەر دەدەمەوە بۆ کەناری چەمەکەو دەگەم بە کەناری ئاوەکە».

گوێچکە ماســـییەکە بەم شێوەیەی کردو هێزی دایە بەر خۆیو هێزەکانی ناخی بەکارهێناو سەرباری نەگونجانی پێکهاتەی لەشیو نەبوونـــی ئـــەو توانایەی کە لە لەشـــی گیاندارەکانی تردا هەبوو، توانیی خۆی بگەیەنێتە شـــوێنی مەبەستیو بەسەر هەموو ڕێگرو بەربەســـتەکاندا زاڵ ببێـــتو بگات بە ئامانجەکـــەیو لە تەنهایی ڕزگاری ببێت!



# پێشبڕکێی هێلانەی جاڵجاڵۆکە

ڕۆژێکی هاوین، پێشبڕکێی جوانترین هێلانەی جاڵجاڵۆکە ڕێك خرا. هەموو بەشداربووان، هەر لە سەرەتای بەیانییەوە کاریان دەکرد.

یەکێك لەجاڵجاڵۆکەکان، لەبەرئەوەی کە زۆر بچووك بوو، زۆر خەمبار بوو؛ چونکە لەخراپی ئەنجامی کارەکەی دەترسا.

بەم شێوەیە هەموو بەشداربووەکان، کارەکانیان تەواو کردو لە شوێنی پارێزراودا دایان نا، جاڵجاڵۆکە هەژارە بچووکەکەش، بەردەوام کاری دەکرد بۆ تەواوکردنی کارەکەی، بەڵام هەرتەواو نەبوو.

داوەرەکە پێی گوت: «نا ئومێد مەبە، تۆ بۆ تەواوکردنی کارەکەت، تا بەرەبەیان کاتت هەیە».

جاڵجاڵۆکە بچووکەکە، سەرباری تانەو توانجی هاوڕێکانی، ڕەتی کردەوە کە واز لە هەوڵدان بهێنێتو بەردەوام بوو لە کارکردن بەکۆڵنەدانەوە.

کاتێك کە هێلانەکەی بەتەواوی درووست کرد، کەمێك دوای بەرزبوونەوەی ئاسۆی بەرەبەیان بوو، شەونمی بەرەبەیان کەوتە سەر هێلانەکەو جوانتری کرد.

بەم شێوەیە جاڵجاڵۆکە بچووکەکە پێشبڕکێی جوانترین هێلانەی چنراوی بەدەست هێنا.

کەواتە: هەرگیز لە هەوڵدان کۆڵ مەدەن، گەرچی دواش کەوتبن؛ چون بەدوور نییە لە ساتی کۆتاییدا، موعجیزە ڕوو بداتو پێشی هەموان بکەون.



# بزنه سه‌رکێشه‌که



بزنێکی جرپن، بەردەوام حەزی لە ســەروخوارکردن بوو لەناو گوندەکــەدا. بەدەم لەوەڕینەوە ڕۆیشــت، هەتا خــۆی لەبەردەمی گوڵێکی جواندا بینییەوە. کاتێك زیاتر لە گوڵەکە نزیك بوویەوە؛ بۆئــەوەی بیخــوات، گوڵەکە بەهەموو هێزییەوە هــاواری کرد بە سەریدا!

-نا، نا! مەمخۆ! تۆ چەندین ساڵ دەرفەتت هەیە بۆ ژیان، بەڵام من ماوەیەکی کەمم هەیە؛ تا بپشــکوێمو بژیم. تکات لێ دەکەم، وازم لــێ بهێنــە، هێندەی تر تەمەنەکەم کــورت مەکەرەوە! جگە لەوەش ئەگەر من بخۆیت؛ ئەنجامێکی باشت نابێتو دەبمە ئافات لەناو جەستەتدا.

بزنەکە ســەری سوڕماو لەجێگای خۆیدا وەستا. لەبەر خۆیەوە گوتی:

«گوڵێك قسە بکات، ئەوە شتێکی ئاسایی نییە!».

پاشان وەك ئەوەی کە نیازی خواردنیی هەبێت، گوتی:

«چەندە جوانە!».

بیــری لەوە کردەوە، کە لە یەك چرکــەدا گوڵەکە بقرتێنێتو بیخــوات. ئــەم کارەی کردو گوڵەکەی لەنــاو بردو خواردی. بۆ بەیانییەکەی بە دەنگی پێکەنین بەخەبەر هات. کاتێك بەتەواوی چاوی کردەوە بینیی کە بزنەکانی هاوڕێی بەدەم سەیرکردنییەوە

پێی پێ دەکەنن. . کە سەیری خۆی کرد بینیی، هەموو مووەکانی لەشی هەڵوەریونو پێستی بەدەرەوەیە.

لەم کاتەدا بزنەکە بیری لە گوڵەکە کردەوە، کە ڕۆژی پێش تر خواردبووی. ئەو پەشیمان بوو لەو کارەی کە کردبووی، بەڵام تازە هیچ نەدەگەڕایەوەو پەشیمانی دادی نەدەدا. ماوەی چەندین ڕۆژ بەم شێوەیە تێپەڕیو بزنەکانی تر بە گۆشەی چاو سەیری بزنەکەیان دەکردو پێی پێدەکەنین. بزنەکە بەدبەخت بوو. بەردەوام سەرزەنشتی خۆی دەکرد؛ کە بەگوێی گوڵەکەی نەکردو ئەوەی بەسەر خۆیدا هێنابوو. بەردەوام بەرەو لاوازبوون دەڕۆشتو وای لێهات کە هیچ موویەك لەسەر جەستەیدا نەمایەوە.

دوای تێپەڕینی ماوەیەکی دووردرێژو چەشتنی ئازارێکی زۆر، وردە وردە مووەکانی سەر لەشی بزنەکە دەستیان کردەوە بە دەرهاتنەوە. . ئیتر ئەوە بوو بە پەند بۆ بزنەکەو بڕیاری دا کە ئیتر کارێکی وا نەکات، کە ببێت بەهۆی ئازاردانی هیچ گیانەوەرو گژوگیایەكو جارێکی تر چڵێسیو سەرکێشی نەکات. .

# پشیلەو مارمێلکە بچووکەکە

ڕۆژێکیان پشیلەیەك برسیی بوو. لە ڕاستیدا ئەو زۆر برسیی بوو. کاتێك کە بە بێحاڵییەوە ڕۆشتە دەرەوە؛ بۆئەوەی کە شتێك بدۆزیتەوەو بیخاتە نێوان ددانەکانی، لەسەر بەردێك مارمێلکەیەکی بچووکی بینی. بەبێ دواکەوتن هەڵیکوتایە سەری. مارمێلکە بچووکەکە پێی گوت:

- ئەی پشیلە، تۆ زۆر نەزانیت. تۆ دەتەوێت مارمێلکەیەکی بێگۆشتو بێئێسك بخۆیت. ئەگەر بەگوێم بکەیت، ڕێگات نیشان دەدەم، کە چۆن ماسییەکی گەورە بگریتو بیخۆیت.

پشیلەکە وەڵامی دایەوە:



- من کاتی گوێگرتنم نییە. من زۆر برسیمە. هەر ئێستا دەتخۆم.

مارمێلکە بچووکەکە بە تکاکردنو پاڕانەوەوە گوتی:

- چاوەڕوان بە، چاوەڕوان بەو گوێم لێ بگرە.

لەکۆتاییدا پشیلەکە ڕازی بوو بە گوێگرتن.

مارمێلکە بچووکەکە پێی گوت:

- سەیری ئەو درەختەی بەردەمت بکە کە لەسەر کەناری ڕووبارەکەیە. بڕۆرە سەر یەکێك لە لقەکانیو دانیشەو چاوەڕوان بە. مێشێکت بەلادا تێدەپەڕێتو بەسەر ئاوەکەدا دەسووڕێتەوەو لە هەمان کاتیشدا بۆقێك خۆی هەڵدەداتە ناو ئاوەکە؛ بۆئەوەی کە مێشەکە بخوات.

- بەڵام تۆ دەتەوێت من شێت بکەیت، یان چی؟! تۆ باسی ماسی گەورەت دەکرد، کەچی ئێستاش. . .

مارمێلکە بچووکەکە قسەکانی بە پشیلەکە بڕیو گوتی:

- چاوەڕوان بە. ماسییە گەورەکە دەگات. دوای بۆقەکە ماسییەکی بچووك دێتە دەرەوە بۆ خواردنی بۆقەکەو شتێکی ڕوونیشە کە لەو کاتەدا ماسییە گەورەکەی تۆ دێتە دەرەوە بۆ خواردنی ماسییە بچووکەکە. بەم شێوەیە دەتوانیت لەسەر لقی درەختەکە بینەری هەموو شتەکان بیت.

ئیتر پشیلەکە، بە پێشنیارو پیلانی مارمێلکە بچووکەکە ڕازی

بوو، بەڵام پێش ئەوەی کە بەری بدات، بە مارمێلکە بچووکەکەی گوت:

- من ئەو کارە دەکەم، کە تۆ دەتەوێتو پێشنیارت کرد بۆم، بەڵام ئەگەر بتەوێت هەڵم بخەڵەتێنیتو کارەکەم هیچ ئەنجامێکی نەبێت، ئەو کاتە تۆ دەخورێیت لەلایەن منەوە.

پاشان پشیلەکە ڕۆشتە سەر لقی درەختەکە. هەرزوو شتەکان بەو شێوەیە ڕوویان دا کە مارمێلکەکە باسی کردبوونو پێشبینیی کردن. . کاتێك کە هاتە سەرەی هاتنە دەرەوەی ماسییە گەورەکە لەناو ئاوەکەدا، پشیلەکە خۆی هەڵدایە ناو ئاوەکەوە، بەڵام ماسییە گەورەکە بە خێرایی خۆی کردەوە بە ناو ئاوەکەدا!!

هەمومان دەزانین کە پشیلە زۆر حەزی لە خواردنی ماسییە، بەڵام بەدبەختانە شناوکردن نازانێت. دەستی کرد بە هاوارکردنو داواکردنی یارمەتی. . مارمێلکە بچووکەکەش لەسەر بەردەکەوە بینەری هەموو دیمەنەکە بوو. لەو کاتەدا کە پشیلەکە خەریك بوو نوغرۆ ببێت، مارمێلکە بچووکەکە هاواری کرد بە سەریدا:

- ئۆو پشیلەی هەژار. تۆش تەواو دەبیتو سەرەنجامت ناو سکی ماسییەکی گەورەیە..





دوو بێچوە ورچەكە

بەیانییەکیان تیشــکێکی گەرمی خۆر هاتە ناو لانەی مام ورچەوە، بۆ نەوازشکردنی دوو بێچووە تازەلەدایکبووەکەی.

دوای گەرمبوونەوەیــان، دوو بێچــووە ورچەکــە چوونە بەردەمی لانەکەیان بۆ هەڵمژینی هەوایەکی خۆشی بەهاری.

دایکەورچیــش ئامــۆژگاری دوو بێچووەکەی کرد، کــە کاتێك ئەو دەڕوات بۆ هێنانەوەی خۆراك بۆیان، پێویستە زۆر لە لانەکەیان دوور نەکەونەوە؛ نەبادا ون ببنو ڕێگە نەهێننەوە.

دوای ڕۆشــتنی دایکیــان، دوو بێچــووە ورچەکە دەســتیان کرد بە یاریکــردن لــە ناو گــوڵو خونچــە بەهارییەکاندا، تیشــکی ڕووناکی خۆریش نەیدەهێشت بەتەواوی چاوەکانیان بکەنەوە؛ چون هێشتا بەو ڕووناکییە بەهێزە ڕانەهاتبوون.

بەدەم یاریکردنو چاوشارکێکردن لەنێوان درەختە بەرزەکانو بەردە گەورەکاندا، بەبێئەوەی ئاگایان لە خۆیان بێت لە لانەکەی خۆیان دوور کەوتنــەوەو زۆری پێنەچوو شــەو داهات. بەدبەختانــە نەیاندەزانی لە کوێن. خەویشیان دەهات. شوێنێکیش نەبوو کە لێی بنوون!

هەرچۆنێکیــان کرد، کونێکی بچووکیــان دۆزییەوە؛ بۆئەوەی هەتا بەیانی خۆیانی تێدا حەشار بدەن. . بەم شێوەیە خەویان لێ کەوت.

لەگەڵ سپێدەی بەیاندا، بە دەم بۆڵە بۆڵێکی پڕ سۆزو موحیبەتەوە لە خەو ڕاچڵەکین. .

دایکەورچ لەوێ بوو.

ئەو هێندە بۆنی کردبوو، هێندە گەڕابوو بەناو دارستانەکەدا، هەتا لە کۆتاییدا خۆشبەختانە ئەوانی دۆزییەوە.

# ماڵی حەلەزۆنەکە

جارێکیـــان، حەلەزۆنێکی هەژار، هەر کە گەشـــتی دەکرد، زۆر خەمباردەبـــوو؛ چونکـــە لە هەمـــوو هاوڕێکانی هێواشـــتر بوو لە ڕۆشتندا.

قالۆنچـــە، هێندەی مشـــك خێرابـــوو لەڕۆشـــتندا، هەزارپێش، خێرابوو هەســـتی بەماندوو بوون نەدەکرد. خلێنکەش بە هەمان شێوە خێرابوو.

حەلەزۆنە هـــەژارە بچووکەکە، لەدوای هەموانەوە دەڕۆشـــتو ئەوان بەجێیان دەهێشتو ئارامیان نەبوو چاوەڕوانی بکەن.

کاتێك کە حەلەزۆنە بچووکەکە دەگەیشتە لایان، گیاندارەکانی تر، پێشـــتر پشـــوویان دابوو، تێریان خواردبـــوو، یارییان کردبوو،



مۆڵیـــان دابـــوو، ماوەیەکی زۆریش بـــوو خەوتبـــوون. لەبەرئەوە حەلەزۆنـــە بچووکەکە جێگەی نەدەماو دەبوو بـــەردەوام، یان لە بەرگەرمای خۆر، یان لە بەرلێزمەی باراندا بێت.

ڕۆژێکیـــان حەلەزۆنەکـــە، گوێچکەماســـییەکی دۆزییـــەوە، کە منداڵێـــك لـــە کەناری دەریاکەدا ونی کردبوو. ڕۆشـــتە پێشـــەوە؛ بۆئـــەوەی باشـــتر بیبینێت. ئیتر تێگەیشـــت کە زۆر ســـووکە بۆ هەلگرتن.

«زۆرباشـــە!» حەلەزۆنەکە خۆشحاڵ بوو گوتی: «ئیتر دەتوانم ماڵێك درووست بکەم».

گوێچکەماســـییەکەی خستە سەرپشتیو ڕۆشت. کاتێ کە گەشتە لای هاوڕێکانـــی، هەموان پێشـــتر خەوتبـــوون. ئیتر حەلەزۆنەکە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو هەموو گیاندارە بچووکەکانی تر حەسوودییان پێی برد.

بەم شـــێوەیە، حەلەزۆنە بچووکەکە پێویستی بەدرووستکردنی خانو نەبوو بۆ هەرشەوێك. ئەو ئیتر، ترسی نە لە خۆری گەورەو نە لەباران نەبوو، دەیتوانی هەرکات بیەوێت، بخەوێت. لە کاتێکدا کـــە هەموو گیاندارەکانی دارســـتان، بۆ خانویـــەك دەگەڕان؛ هەتا تێیدا بمێننەوە، بەڵام حەلەزۆنەکە پێویستی بەوە نەبوو.

# کەنارییە مردووەکە

وەرزی بەهــار بــوو، درەختــەکان ســەوزو پڕ شــەوق بوون. مانگایەکــی مێیینە لەنــاو مەزرایەکدا دەلــەوەڕی. لەناکاو گوێی لە دەنگێکی ســەیر بوو. بەهێواشــی ســەری بەرزکــردەوە، بینی کــە کەنارییەك بەخێراییەکــی زۆرەوە هەڵدەفڕێــتو لەو نزیك دەبێتــەوە. کەنارییەکە وەکــو تیر بە لایدا تێپەڕیو دوای کەمێك دوورکەوتنەوە، لەبەرچاوی ون بوو. . دیســانەوە مانگاکە دەســتی کردەوە بە لەوەڕانی خۆی. .

دوای چەنــد خولەکێــك، مانگاکە هەمان دەنگەکەی پێشــووی



بیست. دیسانەوە کەنارییەکی تر بوو کە بە خێرایی هاتو بەلای مانگاکەدا تێپەڕی. . مانگاکە لە کەنارییەکەی پرسی: بۆچی بەو خێراییە دەڕوات؟ بەڵام کەنارییەکە گوێی لەدەنگی مانگاکە نەبوو، دوورکەوتەوە.

بەم شێوەیە ماوەیەکی تر تێپەڕیو مانگاکە بەردەوام بوو لە سەر کاری خۆی. . دیسان هەمان ڕووداوەکانی پێشوو دووبارە بوونەوەو کەنارییەکی تر بە خێرایی هاتو بەلای مانگاکەدا تێپەڕی. ئەمجارەیان پێش ئەوەی کەنارییەکە بەتەواوی دوور بکەوێتەوە، مانگاکە بە هەموو دەنگییەوە بانگی کەنارییەکەی کرد؛ بۆئەوەی کە گوێی لێ بێت: «بۆچی بەم شێوەیە ڕادەکەیت؟»

کەنارییەکە لای کردەوە بەلای مانگاکەداو کەمێك خێراییەکەی کەم کردەوەو لەسەر لقی درەختێك نیشتەوە. . مانگاکە ویستی بڕواتە لای، بەڵام بینیی کە کەنارییەکە لەسەر درەختەکە کەوتە خوارەوە. کە زیاتر لێی نزیك بوویەوە، بینی کە باڵێکی شکێنراوەو هەموو گیانی خەڵتانی خوێن بووە. مانگاکە ویستی یارمەتیی کەنارییەکە بداتو ڕزگاری بکات، بەڵام بەداخەوە لەبەرئەوەی کە منداڵەکان بەتوندی بەردەکەیان تێگرتبوو، زیانی زۆری پێگەیشتبوو، چیتر بەرگەی نەگرتو هەر لەوێدا گیانی دەرچوو!

# چاویلکەی باش

لــە هەموو دارســـتانەکەدا، خاتوو مشـــکەکوێر ناوبانگێکی زۆر خراپی هەبوو.

ئــەو، تەنانــەت بــۆ ڕۆژ باشــکردنیش لەگــەڵ هیچکامێك لە ئاژەڵەکانی دارســـتان ڕانەدەوەســـتا، هەندێ جاریـــش ئازاری ئەو خشـــۆکانەی دەدا، کە لەســـەر ڕێگاکەی بـــوون؛ چونکە پێی پێدا دەنان.

ئۆگوستینی کەروێشك، کە زیرەکترینی ئاژەڵەکانی دارستان بوو، ڕۆژێکیان بڕیاری دا، سەردانی خاتوو مشکەکوێر بکاتو ڕاستەوخۆ





هۆکاری ئەو ڕەفتارەی لێ بپرسێت.

ئۆگوستین گوتی: «خاتوو مشکەکوێر بۆچی تۆ هەمیشە هێندە بۆڵەبۆڵ دەکەیت؟ تۆ هەرگیز سـڵاو لەکەس ناکەیت، وشـەیەکی میهرەبانیت لێ نابیسترێت؟!»

مشکەکوێر وەڵامی دایەوە: «بەڵام ئەوە تاوانی من نییە؛ چونکە من نابینم. کاتێك چاوم بەشتێك دەکەوێت، کەزۆر درەنگ بووە».

لەبەرئەوە! ئۆگوستین هەموو ئاژەڵەکانی دارستانی کۆ کردەوەو بڕیاریان دا کە جووتێك چاویلکە، پێشکەشـی خاتوو مشـکەکوێر بکەن، بۆ ڕۆژی لەدایکبوونەکەی؛ تا هەموان ببینێت.

ئیتر، لەو کاتەوە هەموان تێگەشـتن کە ئەولە میهرەبانترینو بەڕێزتریـن ئاژەڵەکانـی دارسـتانە. هۆکاری سـڵاونەکردنو پێ پێدانانی خشۆکەکان، هەر ئەو نەبینینەی بووە.

# بێچووه فیله نەخۆشەکە

ساتۆرین، بێچووەفیلێك بوو، كە لەناو كۆمەڵەیەك لە هاوشێوەكانی خۆیدا دەژیا. بەیانییەك كاتێك كە لەخەو هەستا، هەستی بە نەخۆشیو ماندوویێتیو بێ هێزی دەكرد. لەبەرئەوە بڕیاری دا بڕوات بۆ كەناری ڕووبارەكە؛ بۆئەوەی ئاو بخواتەوەو



کەمێك هـــەوا هەڵبمژێت. هەرچەند کـــە زۆر تینووی بوو، بەڵام دەبـــوو چـــاوەڕێ بێت، کە هەموو فیلـــە گەورەکانی تر لە کەناری ئاوەکـــە بڕۆن؛ چـــون ئەگەر پەلەی بکردایـــە، دەبوو بە ژێر پێی ئەوانەوە.

لەبەرئەوە ناچار بوو لە شـــوێنێکی تـــری کەنارەکەوە، کە زۆر قـــوڕ بوو، هەوڵی ئاوخواردنەوە بدات. ویســـتی بـــە هەر نرخێك بووە، ئاو بخواتەوەو خۆی فێنك بکاتەوە، بەڵام زۆر تێنەپەڕی کە هەســـتی کرد وردە وردە بەناو قوڕەکـــەدا دەچێتە خوارەوە، بەڵام نەیتوانـــی بێتـــە دواوە. هەرچەنـــد داوای یارمەتیی لە هاوڕێکانی کرد؛ تا لە مەترســـیی نوقمبوون ڕزگاری بکەن، بەڵام ئەوان پێی پێدەکەنین.

ئیتـــر بێچووەفیلەکە وردەوردە نوغرۆ دەبـــوو لە مردن نزیك دەبوویـــەوە. لوتەدرێژەکەشـــی پـــڕ بوبـــوو لە ئـــاوو نەیدەتوانی هەناســـە بـــدات. . دیمەنێکـــی تراژیدی بوو. . هەتا لە دواســـاتدا، دەســـتێکی میهرەبان هاتو بێچووەفیلەکـــەی لە مردن ڕزگار کرد. ئـــەو خوشـــکەگەورەکەی بوو، کە هـــات بە هـــاواری بێچووەفیلە بچووکە نەخۆشـــەکەوەو ڕزگاری کـــرد. دوای ئەوەی کە لە ئاوەکە دەری هێنایەوە، دەســـتی گرتو بردییەوە بەرەو ماڵەوە. لە ڕێگادا بێچووەفیلەکە، ڕووداوەکەی بۆ خۆشکەکەی گێڕایەوە..



# کاریلە عەجوولەکە

ئیمێلــی کاریلەیەکی بچووکــی جرپنی هەبوو. ئــەم کاریلەیە سەرباری جرپنییەکەی، سەروچاوێکی سەیریشی هەبوو. کاریلەکەی ئیمێلی گوێیەکی ســپیو گەورەبوو، لەسەرەوەش بوو. گوێچکەکەی تریشی ڕەشو بچووک بوو لە خوارەوە بوو.

حەز دەکەن بزانن ئەم کاریلەیە ناوی چییە؟

کاریلەکەی ئیمێلی ناوی «پاف»ە.

پافــی بچووك کاریلەیەکی زۆر ڕووخــۆش بوو. بەدرێژایی ڕۆژ یاری دەکرد. بەڕاســتی ئەو زۆرزانێکی بچــووك بوو. پاف هەموو جارێ یاری تۆپی پێی لەگەڵ ئیمێلیو ئانای هاوڕێیدا دەکرد. کاتێك تۆپەکە دەهات بەرەو ڕووی، پافی بچووك بە پێیە کورتەکانی لێی دەداو بە هەنگاوە بچووکەکانی ڕای دەکرد بە شوێنیدا.

کاتێك ئاناو ئیمێلی، دەیانویســت تۆپەکە بخەنە ناو گۆڵەکەوە، پافی بچووك گۆڵەکەی ڕادەکێشا بۆ دواوە، پاشان بەری دەدا، ئیتر تۆپەکە لە گۆڵەکە دوور دەکەوتەوە.

دووبارەکردنــەوەی ئــەم کارە لەلایەن پافــەوە، زۆرجار دەبوو بەهۆی ماندووبوونی ئاناو ئیمێلــیو زۆرجاریش زویربوونیان لە یەکتری، بەڵام پافی جرپن دەیزانی چۆن ئەم دوو هاوڕێیە ئاشت بکاتەوە. هێندە گاڵتەو یاریی بۆ دەکردن، هەتا هەردووکیان ناچار دەبوون بە پێکەنینەوە بگەڕێنەوە بۆ یارییەکەیانو بەردەوامی پێ بدەنو بە خۆشی کۆتایی پێ بهێنن..



# دیارییەک بۆ ئاسمان

ئاسمان، هێندە دڵگران بوو، کە گریانی نەدەوەستایەوە. . . کە فرمێسکە گەورەکانی دەڕژان، ئاژەڵەکانی سەرزەویش نیگەران دەبوون. دوای وەستانەوەی ئەو بارانە بەخوڕەی کە هەڕەشەی لێ دەکردن، پاشای ئاژەڵەکانی دارستان، بڕیاری دا نوێنەرێك بنێرێت بۆ ئاسمان؛ بۆئەوەی کە سەرەخۆشی لێ بکات. بۆ ئەوکارەش باڵندەی بەهەشتی هەڵبژارد، کە جوانترینیان بوو.

باڵندەی بەهەشتیش داواکەی قەبووڵ کرد، بەڵام نەیدەویست ئەو سەردانە بکات بەبێ دیاری. بۆ ئەوەش داوای لە حەوت لە بەوەفاترینی هاوڕێکانی کرد، کە هەریەکێکیان دانەیەك لەپەڕە جوانەکانیانی پێ بدەن، تا باوەشێنێکی لێ درووست بکات.

لەبەرئەوە توتی جوانترین پەڕی وەنەوشەیی خۆیی پێشکەش کرد، باڵندەی عیشق پەڕێکی نیلی پێشکەش کرد، تاوسیش

پەڕێکی شـــین، دارکونکەرە پەڕێکی سەوز، جرجرە پەڕێکی زەرد، ماسیخۆرە پەڕێکی پرتەقاڵیو بووکەسوورەش پەڕێکی سووری پێ دا. دوای درووستکردنی باوەشێنەکە، باڵندەی بەهەشت دەستی کرد بەهەڵفڕین بەرەو ئاسمانو باوەشێنەکەی لەگەڵ خۆی برد.

دوای گەشـــتێکی دوورودرێـــژ، لە کۆتاییدا باڵندەی بەهەشـــت گەیشتە ئاسمانو پرسیاری لێ کرد، بۆچی هێندە خەمباریت؟

ئاسمانیش وەڵامی دایەوە: «من زۆر هەست بەتەنهایی دەکەم».

باڵندەی بەهەشـــت، باوەشـــێنەکەی پێشکەشـــی ئاســـمان کرد. ئاسمانیش زۆر دڵخۆش بوو، فرمێسکەکانیی سڕی.

هەروەها بەڵێنیشـــی بە ئاسمان دا، کە بە زویی بێتەوە بۆلای هەموو باڵندەکانی تریش بهێنێت لەگەڵ خۆیدا.

ئاسمانیش سوپاســـی کرد: «چەند دیارییەکی جوانە! هەمیشە دەیپارێزمو لەگەڵ خۆمدا دەیهێڵمەوە، هەرکات هەستم بەتەنهاییو غەمباری کرد، دەری دەهێنمو دەیگرم بەدەستمەوە».

لەو کاتـــەوە هەرکات ئاســـمان غەمبار دەبێت، باوەشـــێنەکەی دەردەهێنێـــتو خۆشـــیو پێکەنینی بۆ دەگەڕێتـــەوە. ئێمەش ئەو باوەشێنەی ئاســـمان لە شێوەی کەوانەیەکی حەوت ڕەنگی جواندا دەبینینو ناومان ناوە پەلکەزێڕینە.





# شێرو کەمتیارەکە

لەناو دارستانێکدا، شێرێك دەژیا، کە نۆ بێچووی هەبوو. ڕۆژێکیان لە گەڕانەوەیدا لە ڕاو، بینیی کە تەنها هەشت لە بێچووەکانی ماونەتەوە؛ چونکە کەمتیارەکە یەکێکیانی بردبوو.

بۆ بەیانییەکەشی بێچویەکی تریان ون بوو، ڕۆژی دواتریش یەکێکی ترو، بۆ ڕۆژی سێیەمیش یەکێکی تریان کەمبوویەوە.

ڕۆژی چوارەم، لەکاتی ڕۆشتنیدا بۆ ڕاو، شێرەکە بەبێچووەکانی گوت: «دەمەوێت بزانم کێیە دێتە ئێرەو براکانتان دەدزێت. من لە شوێنێکدا خۆم دەشارمەوە، کە زۆر دوور نەبێت لە ئێوەوە. هەرکە ئەو هات، هەمووتان پێکەوە هاوار بکەن؛ تا بزانم».

شێرەکە ڕۆشتو هەر لەو نزیکانە خۆی شاردەوە. زۆر نەبوو چاوەڕوانی دەکرد، کە کەمتیارەکە هات. لەگەڵ هاواری بێچووەکانی

شێرەکە وەکوو تیر بە بازدان هاتو پەڕییە سەر پشتی کەمتیارەکەو هەر چوارپەلی شکاند، بەڵام پێش ئەوەی کە بەتەواى لەناوى ببات، کەمتیارەکە هەرچۆنی کرد توانیی بە جەستەی خوێناویو شکاوەوە خۆی ڕزگار بکاتو لەو ناوچەیە دوور بکەوێتەوە. خۆی گەیاندەوە لای بێشەکەی خۆیو بەردەستەکانی؛ چونکە لەو بێشەیەدا خۆی گەورەو کاربەدەست بوو.

شێرەکە دەستی کرد بەگەڕان بەدوای کەمتیارەکەدا؛ بۆئەوەی کە بەتەواى لەناوى ببات، بەڵام گەڕانەکەی بێهودە بوو. لەگەڕانیدا چاوی بە مەیمونێك کەوت. پێی گوت: «دەزانم کە تۆ زۆر دەگەڕێیت، دەزانی لانەی کەمتیارەکەش لەکوێیە. شوێنەکەیم نیشان بدە!»

مەیمونەکە شێرەکەی برد، لەگەڵ خۆیدا. سەیریان کرد کەروێشکێکی کێوی بەگیتارێکەوە خەریکی گۆرانی گوتنە. ئەو گۆرانی دەوتو پشیلەی گەورەی بێشەکەش وەڵامی پرسیارەکانیی بەگۆرانی گوتنەوە دەدایەوە:

«ئەو پێستە چییە؟ کەروێشکەکە پرسیاری کرد.

- ئەوە پێستی ئەو گیاندارانەیە کە گەورەکەمان خواردوونی!

- ئەی ئەوانە؟

- ئەوانەش پێستی ئەو ئاژەڵانەی ترە کە لەلایەن گەورەکەمانەوە

حەپەلووش کراون».

بە چونە ژوورەوەی شـێرەکە، هەموویان زۆر ترسانو ویستیان هەڵبێن.

«کەس نەجووڵێت، هەموتان دەخنکێنم. . . ، شێرەکە نەڕاندی.

«بەردەوام بە! بـەردەوام بە، ئەگەر بەردەوام نەبی دەتخۆم!»، شـێرەکە فەرمانی دا بەسـەر کەروێشـکەکەدا کـە گۆرانییەکەی وەستاندبوو.

کەروێشـکەکە دەستی کردەوە بەگۆرانی گوتن: «ئەو پێستە هی کێیە لەوێ؟ کەس وەڵامی نەدایەوە!»، «ئەو پێستە چییە لەوێ؟»، دیسانەوە کەس وەڵامی نەدایەوە.

«وەڵام بدەنەوە»، شـێرەکە نەڕاندی. ئیتر دەستی کرد بەسەما کردنو گۆرانی گوتنو پرسـیارکردن: «ئەو پێسـتە چییە لەوێ؟ کەروێشـك وەڵامم بدەرەوە، تۆ پرسیارت لێکراوە، هەرئێستا وەڵام بدەرەوە!»

کەروێشکەکە وەڵامی دایەوە: «ئەوە پێستی ئەو کەرە کێوییە، کە گەورەکەمان ڕاوی کردو خواردی. . . ئەوەش پێستی ئەو مانگا کێوییە، کە گەروەکەمان هەڵیدڕیو خواردی. . . »

شێرەکە گەشتە لای ڕیزی سێیەمی پێستەکانو نەڕاندی: «ئەو پێستانە هی کێن؟

کەروێشکەکە نەیدەزانی چی بڵێت:

- ئەوانە، پێستی ئێ، ئێ. . .

- ئــەوە چ ناوێکە؟ ئێ، ئێ! ئــەوە ناو نییە! هەر ئەمجار لێت دەپرسمەوە، ئەو پێستانە هی کێن؟ ڕاستم پێ بڵێ، ئەگینا هەموو گیانت تێك دەشکێنم.

کەروێشکەکە لەژێرلێوەوە کە هەموو گیانیشی لەترسا دەلەرزی گوتی:

- ئەوانە پێستی بێچووەکانی تۆن!

بەبیستنی ئەم قسانە، شێرەکە لەتاو تووڕەیی گڕی گرتو کەوتە گیانی ئاژەڵەکانی ئەوێ. پاشــان ڕۆشـــت بەدوای کەمتیارەکەشدا؛ بۆئەوەی بیگرێت.

دوای کوشـــتارەکە، شـــێرەکە ڕووی کردە ئاژەڵەکانی بێشـــەکەو فەرمانـــی کـــرد بەســـەریاندا، کە بـــڕۆن خواردنی بـــۆ بهێننەوە. دوای ماوەیـــەك هەر یەکێیـــان بەهەندێك خۆراکـــەوە گەڕایەوە: کەروێشـــکەکە هەندێك گێزەری بۆ هێنابوویەوە، پشـــیلەکە چەند مریشـــکێکی بۆهێنابـــوو، مەیمونەکەش چەنـــد تەماتەیەك و. . ، بەڵام بزنە کێوی هیچی دەست نەکەوتبوو.

ڕۆژی دواتـــر، لەکاتـــی ناردنـــی ئاژەڵەکاندا بۆگـــەڕان بەدوای خۆراکدا، شێرەکە گوتی: لەئێستە بەدواوە من شاژنی ئەم بێشەیەم

لەجێگەی کەمتیارەکە.

هەروەها بە بزنە کێویەکەشی گوت: ئەگەر ئەمجار بەبێ هیچو بەدەستی خاڵی گەڕایتەوە، نەیەیتەوە بۆئێرە چونکە دەتکوژم!

بزنە کێویەکە بەدەم گریانەوە ڕۆشت.

پیرێژنێـــك کە هاتبوو بـــۆ ئەو ناوچەیەو چـــاوی پێی کەوت، لێی پرســـی: «بزنـــە کێوی بۆچـــی دەگری؟». بزنەکەش ڕاســـتی ڕووداوەکـــەی بۆگێڕایـــەوەو پێی گوت کە ژیانی لە مەترســـیدایە، لەکاتێکدا هیچ تاوانێکیشی نەکردووە.

پیرێژنەکـــەش پێی گـــوت: «دڵنیا بە، ئەگەر پێت خۆشـــبێت دەتبەم لەگەڵ خۆمداو لەدەستی شێرەکە ڕزگارت دەکەم.

بزنـــە کێویەکە سوپاســـی پیرێژنەکەی کردو بەخۆشـــحاڵییەوە چـــوو لەگەڵیدا. ئیتر لەو ڕۆژەوە، بزنەکێویو پیرێژنەکە بوون بە دوهاوڕێی خۆشەویســـتی یەکتر. بزنە کێویەکە بەردەوام گوێڕایەڵی پیرێژنەکـــەی دەکـــردو لەقســـەی دەرنەدەچوو، لەبەرامبەریشـــدا ســـەلامەتیو پارێزرانی گیانی، لە دەستی شـــێرەکە، لە پیرێژنەکە وەرگرت.





# کلۆریی ددانەکان

جارێکیـــان پێری بچـووك، لەگەڵ دایکیدا ســـەیری گۆڤارێکی تەندرووســـتی دەکردو دایکی ڕوونکردنەوەی لەسەر وێنەکانی ناو گۆڤارەکە پێ دەدا، کەوتە پرسیارکردن لە دایکی.

- دایە، ئەوە چییە؟

- کـــورِم ئەوە ددانێکە کـــە کلۆر بـــووە، ئەگەریش گرنگی پێ نەدرێت، کلۆرییەکەی زیاتر دەبێت.

- ئەو کلۆرییە چییە؟ بۆ درووست دەبێت؟ چۆن لادەچێت؟

- زۆر درەنگە کوڕم، کاتی نووستنە. شەوشاد. ماچ. . .

دوای ماچکردنـــی دایکـــیو ڕۆشـــتنی، پێـــری بچـــووك لامپی ژوورســـەرەکەی کوژاندەوە، بەڵام چاوە گەورەکانی لەناو تاریکیدا هەر بەکراوەیی مابوونەوە. پێری کەوتە بیرکردنەوە:

- ددانـــی کلۆر ، بەڵام بۆچـــی ددان وای لێ دێت؟ ئەی کلۆری چۆنە؟ چی تێدایە؟ کێ ددان کلۆر دەکات؟ ئەمە شتێکی نهێنیئامێزە، پێویستە بەدواداچونی پێویست بکەم.

پێـــری بچـــووك، ئەو شـــەوە خەوی ترســـناکی بینـــی. خەوی بـــە ددانەکانییـــەوە بینی. . لـــە خەوەکەیدا، ددانەکانـــی درزیان تێکەوتبـــوو، ڕەش بوبوونەوەو داڕزابوون. بەمە زۆر نیگەران بوو؛ چونکە ئەم ڕەشـــبوونەوەیە، دەبوو بەهۆی نەخۆشکەوتنو کەوتنە بەر مەترســـیی میکرۆبەکانەوە. لە خەوەکەیدا پرســـیاری دەکرد: چـــی لەناو ئەو کلۆرییـــەدا دەژی؟ ئایا زیندەوەرەکانی ناو کلۆریو ڕزیویەکانی ددانی زیانبەخشن؟

هـــەر لـــە خەوەکەیدا پێری بچووك، ســـوپایەك لـــە میکرۆبو بەکتریای زیانبەخشی ڕەشو خۆڵەمێشی لەناو کلۆری ددانەکانیدا بینی، کە بـــەردەوام بەبێدەنگی خەریکی جووڵانو بەیەکداچوون بوون. پێری بچووك ویســـتی لەو میکـــرۆبو بەکتریایانەدا نزیك ببێتەوەو بکەوێتە پرســـیارکردن لێیان، بـــەڵام پێش ئەوەی هیچ

بڵێت لە خەوەکەی ڕاپەڕی. . کە سەیری کاتژمێرەکەی کرد، کاتی هەستان لە خەوو ڕۆیشتن بۆ قوتابخانەی بوو. پێری بچووك دوای خواردنی نانی بەیانی، دایکی بردی بۆ قوتابخانە. لە ڕێگادا چەند جارێك ویستی لەبارەی بابەتەکەی شەوو کلۆری ددانەکانەوە پرسیار لە دایکی بکات، بەڵام بەداخەوە، دایکی پێری بەیانیان تاقەتی قسەکردنو وەڵامدانەوەی نەبوو.

لەبەرئەوە پێری بچووك بڕیاری دا کە پرسیارەکانی خۆی ئاراستەی مامۆستاکەی بکات. لەگەڵ ڕۆشتنی بۆ ناو پۆلەکەیو هاتنی مامۆستاکەی، ڕۆشتە لایو لەبارەی کلۆری ددانەکان پرسیاری لێ کرد، بەڵام مامۆستاکەی پێی ڕاگەیاند، کە ئەو ناتوانێت لەو بارەیەوە زانیاریی تەواو بدات؛ چونکە ئەوە پیشەی ئەو نییە، بەڵام بەڵێنی پێدا کە لە زووترین کاتدا پزیشکی ددان بانگهێشتی قوتابخانەکەیان بکەنو پشکنین بۆ ددانی هەموو قوتابیەکان بکەن. . دوای هاتنی پزیشکی ددانو پشکنینی ددانی قوتابیەکان، پێیری بچووکیش دڵنیا بوو لە کلۆرنەبوونی ددانەکانیو وەڵامی هەموو پرسیارەکانی خۆی لە پزیشکەکە وەرگرت. .

ئیتر پێری بچووك خەوی ناخۆشی بە ددانەکانییەوە نەبینی.



# چەقەڵو سووچەڕەکە

چەقەڵو سووچەڕێك، پێکەوە لە مەزرایەکدا دەژیان. ڕۆژێکیان کۆچەرییەکان هاتنو لەسەر جێگەکەی ئەوان نیشتەجێ بوونو ڕەشماڵیان هەڵدا. کاتێك کە چەقەڵو سووچەر بینیان چەند بزنێکی کۆچەرییەکان لە شوێنەکەیاندا دەلەوەڕنو گیاسەوزەکەی دەخۆن. ڕۆشتنە پێشەوەو پێیان گوتن: ئێوە زیان بە ئێمە دەگەیەنن! تکایە بڕۆن بۆشوێنێکی ترو لەوەڕگاکەی ئێمە بەجێ بهێڵن!

ئەوانیش وەڵامیان دانەوە:

- ئێمە لێرە ناڕۆین!»

هەردووکیـــان بـــەو وەڵامـــە زۆر نیگەران بـــوون. . . ڕۆژێکیان چەقەڵەکە بە سووچەڕەکەی گوت:

«با تیروپشـــکێك بکەین، هەرکامێکمان دەرچوو، دەچێتە سەر پشـــتی ئەوی تـــرو دەکەوینە بزنـــی کۆچەرییەکانو بـــە تالانیان دەبەین!».

ســـووچەڕەکەش وەڵامـــی دایەوە: «پشـــت بە خودا، با دەســـت پێبکەین»، دەستیان پێ کرد.

لـــە تیروپشـــکەکەدا، ســـووچەڕەکە دەرچـــوو؛ بۆئـــەوەی کـــە چەقەڵەکە بچێتە سەرپشتی. زینێکیان هێناو خستیانە سەر پشتی ســـووچەڕەکە، بەڵام نەیتوانی لەجێگەی خۆیدا بجووڵێت؛ چونکە زینەکـــە دەگەشـــتە ســـەرزەوی. بەچەقەڵەکەی گـــوت: «تۆ چۆن دەتەوێت بێیتە سەر پشتی من، من بچووکو کورتیشم. با زینەکە بخەینە سەر پشتی تۆ، تۆ گەورەو درێژیت!

چەقەڵەکەش گوتی:

- باشە. کە مادەم وایە، تۆ وەرە سەر پشتی من».

زینەکـــە ڕێك پڕ بە بەری چەقەڵەکە بوو. ســـووچەڕەکە پێی خستە سەر جێ پێکەو هاواری کرد: «من دەتوانم، هەموو بزنەکان

لەناو ببەم!» ڕیشمەکەی گرتو کەوتنە ڕاوکردنی بزنەکان.

بـــەڵام لەماوەیەکی زۆر کەمدا کۆچەرییەکان ســـووچەڕەکەیان ڕاوناو بانگی سەگە ڕاوچیەکانیان کرد؛ تا ڕاویان بنێن. چەقەڵەکە زۆر ترسابوو، گوتی بەسووچەڕەکە: «هاوڕێکەم، تکایە ڕیشمەکە شل بکە؛ تا خێرا خۆم ڕزگار بکەم، سەگەڕاوچییەکان بە شوێنمەوەنو خەریکە دەمگرن!»

ڕایان کردو ڕۆیشـــتن تا گەیشـــتنە لای ڕووبارێـــك. چەقەڵەکە پەڕییەوە، بەڵام ســـووچەڕەکە لەســـەر پشـــتی چەقەڵەکە کەوتە خوارەوەو هەرچەند داوای یارمەتیشـــی لە چەقەڵەکە کرد، بەڵام بـــێ وەڵام بوو. هەرچۆن بوو خۆی گەیاندە کەنارو لەژێر دڕکێکی گەورەدا، خۆی شاردەوە.

لـــەو کاتەدا کەخەڵکـــە کۆچەرییەکان خەریکـــی بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسمێکی هاوسەرگیری بوون. ژنەکان هاتبوون بۆ کۆکردنەوەی چیلکەودار بۆ لێنانی چێشتنی ئاهەنگەکە. لەناکاو سووچەڕەکەیان لەژێر دڕکەکەدا دۆزییەوە.

پیرێژنێیکیـــان هەڵیگرتو گوتی: «ئـــۆو! ئەمە دوژمنەکەمانە، ئەمە تۆ بۆ ئەوە هاتویتە ئێرە؛ تا من بتدۆزمەوە!»

پاشان بردی بۆلای خەڵکی ئاهەنگەکە، بەڵام ئەوان پێیان گوت: «ئێمە سەرقاڵین، کەس نییە چاودێری ئەمە بکات!»

لەبەرئەوە سووچەڕەکەی بردو بەگیرەیەك بەستییەوە بە داری ڕاگری ڕەشماڵەکەداو لەلایدا دانیشت.

سووچەڕەکەش دەستی کرد بەگریان. پیرێژنەکە لێی پرسی: «چییە؟ بۆ دەگری، کارەکەی من ئازارت دەدات؟

سووچەڕەکەش وەڵامی دایەوە:

- ئەوەی کە من غەمبار دەکات، ئەوەیە کەتۆ لەلای من ماویتەوە؛ تا چاودێریم بکەیت، لە کاتێکدا کە ژنو پیاوەکانی تر خەریکی ئاهەنگگێڕانن بەدەم خواردنو خواردنەوەوە!»

بەم قسانە پیرێژنەکەی هانداو ڕۆشت بەرەو لای ئاهەنگەکەو تا بەشی خۆی خواردن وەربگرێت، بەڵام پێش ئەوە سەگە ڕاوچییەکەی دانا؛ بۆئەوەی تا کاتی گەڕانەوەی، چاودێریی سووچەڕەکە بکات. سەگەڕاوچییەکەش لەبەردەم سووچەڕەکەدا ئەژنۆی داداو گوێی گرت لە قسەکانی: «خودا بتگرێت، نەفرەتی، نەزان. هاوڕێکانت تێریان خوارد لە گۆشتو ئێسقانو کەچی تۆش دانیشتوویت، چاودێری من دەکەیت! بۆچی تۆش ناڕۆیت وەکو ئەوان تێر بخۆیت؟»

بەم قسانە سەگەکەش ڕازی بوو، ڕۆیشت بۆلای پیرێژنەکەو پێی گوت: «وەرە برۆ بەدوای یەکێکی تردا بگەڕێ، تاچاودێریی نێچیرەکەت بکات. منیش دەمەوێت بەشی خۆم بخۆم!».

ناچار پیرێژنەکە، خۆی گەڕایەوە بۆلای سووچەڕەکە؛ تاچاودێریی بکات، بەڵام هەرکە گەشتە ئەوێ دەستی کرد بەگریان؛ چونکە لەکاتی مشتومڕی پیرێژنەکە لەگەڵ سەگەکەدا، سووچەڕەکە هەرچۆنی کردبوو خۆی ڕزگارکردبوو، هەتاپیرێژنەکە گەیشتەلای ڕەشماڵەکە سووچەڕەکە بەهەوادا یاری دەکردو بەرز بووبوویەوەو بۆ هەمیشە ماڵئاوایی کرد لە پیرێژنەکەو ئازاد بوو.

ئەمەش عاقڵی ئەو گیانەوەرە بچووکە بوو، کە توانیی پیرێژنو سەگەکەش ڕازی بکات؛ بۆئەوەی بەجێی بهێڵنو سوود لەو دەرفەتە وەربگرێتو خۆی ڕزگار بکات.



# قالۆنچەیەكی تینوو



پاشنیوەڕۆیەكی بەهار، هەوا سەررێژ بوو لە ویزەویزی حەشەرەكانو گۆرانیی چۆلەكەكان. لەژێر ئاسمانی شیندا، مەزرا سەوزەكە، پڕ بوو لە سەمای پەپوولەكان، گوڵو گیاكان بە شنەباكە نەوازش دەكران. قالۆنچەیەك لەسەر ئەو لقە بچووكەی درەختەكە نیشتەوە، كە چەمی بوویەوە بەرەو لای قەدەكەی. ئەم قالۆنچەیە زۆر تینووی بوو. لەپشتی لقە بچووكە سەوزەكەدا، دڵۆپە ئاوێك دەدرەوشایەوە. لەبەرئەوە خۆی نزیك كردەوە؛ تا تینوێتی خۆی پێ بشكێنێت. بەهۆی ئەوەی كە لقە بچووكەكە، كەوتە

لەرینــــەوە، قالۆنچەکە جوولەکەی خۆی هێواش کردەوە؛ بۆئەوەی کــە لەرینەوەی لقەکــە بوەســتێتەوەو دڵۆپە ئاوەکــە نەکەوێتە خــوارەوە، بەڵام لەو کاتەدا کە خەریك بــوو لێی نزیك ببێتەوە، لەناکاو بەهۆی بایەکی توندەوە، هەموو شتەکان بەخێرایی گۆڕان، لقــە بچووکەکە کەوتەوە جووڵانو ئەمجارەیــان نەك هەر دڵۆپە ئاوەکــە، بەڵکو قالۆنچەکەش پێش ئەوەی کــە بتوانێت باڵەکانی بکاتـــەوە، کەوتە ناو گۆمە ئاوەکەی ژێر درەختەکەوە. لەبەر ئەوە نائومێد بوو لە گەیشــتن بە ئامانجەکــەی، کە خواردنەوەی ئاوو شــکاندنی تینوێتییەکەی بوو. قالۆنچەکە لەناو ئاوەکەدا خەریك بوو نوغرۆ ببێت، بەڵام پێش ئەوەی کە بەتەواوی خۆی بدات بە دەســـتەوە، هێزێکی دایەوە بەرخـــۆیو هەرچۆنێکی کرد، باڵەکانی کردەوەو خۆی لەناو ئاوەکەدا ڕزگار کرد. بەم شــێوەیە قالۆنچەکە لە تینوێتیو خنکانیش ڕزگار بوو.



# چەقەڵە بچووکو حوشترەکە

چەقەڵە بچووکەکە، ئاژەڵێکی زۆر فێڵبازبوو، بەڵام بەداخەوە تەنانەت نەیدەتوانی سوود لەو فێڵبازییەی وەربگرێت بۆ پاراستنی خۆشی. لەگەڵ ئەوەشدا حەزی لە فریودانی دەوروبەریشی هەبوو! هەروەك چۆن هەموومان باسی فێڵبازی چەقەڵمان بیستووە.

چەقەڵەکە زۆر حەزی بە خواردنی گوێچکە ماسیو قرژاڵ دەکرد. دوای ئەوەی لەو لایەی دەریاچەی، کە ئەمی لێ بوو، هەموو گوێچکەماسیو قرژاڵەکانی خوارد، بڕیاری دا کە بچێت بۆ ئەو بەری دەریاچەکە؛ چونکە پێی وابوو، ئەوێ زۆری تێدان.

بەڵام دەریاچەکە زۆر پانو فراوان بوو، شەپۆلی ئاوەکەش زۆر بەهێزبوو، نەیدەتوانی بەمەلەکردن لێی بپەڕێتەوە. ماوەیەکی زۆر بیری کردەوە، تا ڕۆژێکیان ڕۆشت بۆلای حوشتری هاوڕێی.

پێی گوت: «حوشتری هاوڕێم، من ڕێگایەك دەزانم، کە کێڵگەیەکی قامیشی لێیە. ئەگەر بمخەیتە سەر پشتت، منیش نیشانت دەدەم.

حوشترەکەش کە زۆرحەزی لەقامیش بوو، گوتی:

- بەخۆشحاڵییەوە، لە کوێیە؟

- لەو بەری ڕووبارەکەوەیە. ئەگەر بێمە سەر پشتت بەئاسانی دەگەینە ئەوبەر.

حوشترەکە داواکاری تری نەبوو. چەقەڵە بچووکەکە ڕۆشتە سەر پشتی، لەنێوان دوو قوچکەکەی پشتیدا دانیشت. حوشترەکەش بەمەلەکردن لەڕووبارەکە پەڕییەوە.

کاتێك گەیشتنە کەنارەکە، چەقەڵە بچووکەکە لەسەر پشتی حوشترەکە دابەزی، کێڵگەی قامیشەکەی نیشانی حوشترەکەداو خۆشی ڕای کرد بۆلای ڕووبارەکە بۆ دۆزینەوەی قرژاڵو گوێچکەماسی. لەو ماوەیەدا، حوشترەکە خۆی تێرکرد بەبێ بیرکردنەوە لە هیچ شتێك.

پێش ئەوەی کەحوشترەکە لەناو کێڵگەی قامیشەکەدا بێتە دەرەوە، چەقەڵە بچووکەکەش تێری خوارد. هەروەك چۆن پیشەی هەمیشەیی حەسادەتو فیڵبازی بوو، چەقەڵەکە دەستی کرد بە ڕاکردن بەدەوری کێڵگەکەداو دەنگەدەنگێکی زۆری درووست کرد. بەوەش گوندنشینەکان گوێبیست بوونو خێراڕۆیشتن بەرەو کێڵگەی

قامیشەکە. گوتیان: «ئەوە چەقەڵە لەناو کێڵگەی قامیشەکانماندا. ئێستا هەموو بەرهەمەکەی خراپ کردوین. دەبێت هەرئێستا ڕاوی بکەین».

بەپەلە بە گاڵۆکەکانیانەوە گەیشــتنە ئــەوێ، بەڵام چەقەڵیان نەبینــی. حوشــترێکی گەورە بــوو، کە بە خرمەخــرم، خەریکی خواردنــی قامیشــەکان بــوو. دایانە بــەر بەردو بەگاڵــۆك لێیان دا. پاشــان دەریان کرد. کاتێك گوندنشــینەکان ڕۆشــتن، چەقەڵە بچووکەکە بە سەماکردنەوە هات. گوتی بەهاوڕێکەی:



«دەبێت ئێستا بڕۆین.

حوشترەکەش گوتی:

- باشە. هاوڕێ، بەڵام بۆچی دەستت کرد بەلوورەلوور؟

چەقەڵەکە وەڵامی دایەوە:

نازانم! ئەوە خوی هەمیشــەیی منە، دوای خواردن بەم شێوەیە دەست دەکەم بەگۆرانی گوتن.

حوشترەکە گوتی:

- زۆرباشە. ئێستا وەرە سەرکەوە.

چەقەڵەکە چووە ســەر پشتی حوشــترەکەو ڕۆشتنەوە بۆ ناو ئاوەکە. کاتێك گەشــتنە نیوەی ڕێگاکە، لەناوەڕاستی ڕووبارەکەدا وەستاو گوتی:

- چەقەڵی هاوڕێم؟

چەقەڵە بچووکەکەش وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، دەڵێی چی؟

- منیش حەزو خوویەکی سـەیرم هەیە. منیش حەزدەکەم لە ناوەڕاستی ئەم ئاوەدا هەندێك سەما بکەم.

چەقەڵەکە هاواری کرد:

- تۆ سەما دەکەیت؟ وا مەکە هاوڕێکەم. تۆ دەتەوێت من نوقم بکەیـت! چی بـوو، وا ئەم بیرۆکەیەت بۆهـات؟ بۆچی دەتەوێت سەما بکەیت؟

حوشترەکەش وەڵامی دایەوە:

- نازانم! ئەوەش خوویەکی منە کە لەناو ئاودا دەسـت دەکەم بەسەماکردن، دوای خواردن!»

حوشـترەکە دەسـتی کـرد بەسـەماکردنو سـووڕانەوە لەناو ئاوەکەدا. هەتا چەقەڵەکە کەوتە ناو ئاوەکەوە، بەڵام پێش ئەوەی بەتەواوی نوقم ببێت، دوای هەوڵو زەحمەتێکی زۆر توانیی خۆی بگەیەنێتە کەناری ئاوەکە.

حوشـترەکەش گەڕایەوە بۆ شـوێنەکەی خۆیو بڕیاریشیدا کە ئیتر هەرگیز لەگەڵ چەقەڵی فێڵبازو درۆزندا قسە نەکات.



# کوڕێکی هەژار

سەردەمانی زوو، کوڕێکی هەژار، لە شارێکدا دەژیا. ئەم کوڕە نە دایکی هەبوو، نە باوك، هەتیو بوو. لەبەرئەوە لەلای مامیو ئامۆژنی دەژیا. مامی زۆر میهرەبان بوو، بەڵام ژنەکەی جادوگەرێکی زۆر خراپ بوو، ڕەفتاری لەگەڵ ئەم کوڕەدا، زۆر خراپ بوو، بەردەوام لە دژی ئەم کوڕە، هانی مامیشی دەدا.

ڕۆژان تێپەڕین، هەتا ژنەکەی مامیشی کوڕێکی بوو. ئەم دوو کوڕە زۆر خۆشەویستییان بۆ یەکتری هەبوو، بەردەوام پێکەوە یارییان دەکرد. . جەژن هاتە پێشەوەو کوڕەکەی مامی دیاریو جەژنانەیەکی زۆری کۆ کردەوە، بەڵام ئەم کوڕە هەتیوە، هیچی نەبوو. تەنها شتێك کە ئەو هەیبوو، خەمی زۆری بێکەسیو بێنازی بوو. کاتێك کە میوانەکان گەیشتن، مامی داوای لەم کوڕە بچووکە کرد، کە بڕوات لە گەرماوەکەدا بەبێ دەنگی خۆی بشارێتەوە؛ بۆئەوەی کە میوانەکان نەیبینن. ئەم کوڕە هەژارە، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە، لەوێدا مایەوە بە برسێتی.. دوای ڕۆشتنی

میوانـــەکان، داوای لـــە مامی کـــرد، کە کەمێك پـــارەی پێ بدات؛ تا پێویســـتییەکانی خـــۆی پێ بکڕێت، بەڵام مامـــی داواکەی ڕەت کردەوە. کوڕە بچووکەکە بەوە دڵتەنگ بوو، ڕۆشـــتە دەرەوە؛ هەتا هەوایـــەك هەڵمژێت، لەو کاتەدا کەمێك پارەی دۆزییەوە. ئەویش ئەمەی بەهەل زانی؛ بۆئەوەی کە بڕوات کەمێك نانی پێ بکڕێت؛ چون زۆر برســـیی بوو. کاتێك کە کـــوڕە بچووکەکە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، مامی چاوی پێ کەوتو گومانی کرد، کە ئەو پارەیەی لەو دزیـــوە. لەبەرئەوە لەماڵەکەی خـــۆی دەری کرد. کوڕە بچووکەکە بەهۆی کەمـــی تەمەنیو لاوازییەوە، نەیتوانـــی هیچ بەرگرییەك لـــە خۆی بکات، بەم شـــێوەیە ئـــاوارەی کۆڵانەکان بوو، هەمیشـــە خراپەی بەرامبەر دەکرا. . ســـاڵانێکی زۆر، ســـەختییەکانی ژیانی ئەم کوڕە بچووکە، بەم شـــێوەیە هەر بەردەوام بوون. . تا ئەوەی ڕۆژێکیان، کەسێك کە لە دادگاوە ڕاسپێردرابوو، هاتە لای کوڕەکەو پێـــی ڕاگەیاند کە باوکی پێش ئـــەوەی بمرێت، بڕێکی زۆر پارەی لـــە بانك بۆ داناوە، پێویســـتە بـــڕوات وەری بگرێتەوە بۆ خۆی. . بەم شێوەیە، کوڕە بچووكو هەتیوەکە بوو، بە کەسێکی پێگەشتوو تێگەشتوو گەیشـــت بە خۆشبەختییەکی زۆرو توانیی لەسەر پێی خۆی بوەستێتو پێویستی بە هیچ کەسو سەرپەرشتیارێك نەبێت، تەنانەت مامیشی. .



# کڵاوسووری بچووک

جارێکیان لەگوندێکدا، کچێکی بچکۆلەی زۆرجوان دەژیا. ئەم کچە بچووکە، کڵاوێکی سووری بچووکی هەبوو، کە زۆر لێی دەهات، لەبەرئەوە هەموان پێیان دەگوت: کڵاوسووری بچووك.

ڕۆژێکیان، دایکی هەندێك کولیچەی درووست کردو بەکڵاوسووری گوت: «برۆ بۆلای داپیرەت، زۆر نەخۆشە، ئەم کولیچەیەو ئەم قاپە بچووکە پەنیرەشی بۆ ببە».

کڵاوسووری بچووك، هەر زوو کەوتە سەر ڕێ بۆلای داپیرەی، ئەو لەگوندێکی تردا دەژیا. لەکاتی ڕۆشتنیدا، بەناو دارستانێکدا تێپەڕی، لەناو دارستانەکەدا چاوی کەوت بە گورگێك، کە نیازی

خواردنی کڵاوسووری هەبوو، بەڵام نەیوێرا ئەو کارە بکات؛ چونکە چەند داربڕێك لەناو دارستانەکەدا بوون. گورگەکە پرسیاری لە کڵاوسوور کرد، کە بۆکوێ دەڕوات. کڵاوسووری هەژار، کە نەیدەزانی ئەو گورگە مەترسیدارە، لە گەڵیدا وەستاو گوێی لە گورگەکە گرتو وەڵامی دایەوە: «دەڕۆم بۆ سەردانی داپیرەم، هەندێك کولیچەو قاپێکی بچووك پەنیرم پێیە، کە دایکم بۆی ناردووە».

گورگەکە پرسیی: ماڵی داپیرەت لێرەوە دوورە؟

کڵاوسووری بچووك گوتی: ئۆوا بەڵێ ماڵی زۆر دوورە، لەوبەری ئاشەکەوەیە. یەکەم ماڵی گوندەکەیە.

گورگەکە گوتی: ئێ باشە منیش دەمەوێت بڕۆمو ببیبینم. من بەم ڕێگایەدا دەڕۆمو تۆش بەو ڕێگایەی تردا بڕۆ. با بزانین کاممان زووتر دەگەین».

گورگەکە بەهەموو توانایەوە دەستی کرد بەڕاکردن بە ڕێگا کورتەکەدا. کڵاوسووری بچووکیش بەو ڕێگایەدا ڕۆیشت، کە زۆر دووروودرێژ بوو. لە ڕێگادا دەستی کرد بەچنینەوەی گوڵو ڕاکردن بەدوای پەپوولەدا.

گورگەکە زۆری پێ نەچوو، گەشتە ماڵی داپیرەی کڵاوسوور. لەدەرگای دا: تەق، تەق. داپیرەی گوتی: «کێیە؟»

گورگەکە دەنگیی ناسك کردەوەو گوتی: ئەوە کچە بچووکەکەتانە، کڵاوسووری بچووك، کولیچەو پەنیرم بۆ هێناویت، کە دایکم بۆی ناردوویت».

داپیرەی میهرەبان، بەهۆی ئەوەی کە نەخۆش بوو، لەناو جێگاکەیدا کەوتبوو، هاواری کرد: «دەسکی دەرگاکە ڕاکێشە، ئازیزەکەم».

گورگەکە دەسکی دەرگاکەی ڕاکێشاو دەرگاکە کرایەوە. یەکسەر خۆی دا بەسەر داپیرەداو هەرزو خواردی؛ چونکە سێ ڕۆژ بوو، هیچی نەخواردبوو، زۆر برسیی بوو. پاشان دەرگاکەی داخستو ڕۆشت لەجێگاکەی داپیرەدا ڕاکشا. چاوەڕوانی کرد، تا کڵاوسووری بچووك گەیشتو لەدەرگاکەی دا: تەق، تەق.

گورگەکە گوتی: کێیە لەدەرگا دەدات؟

کڵاوسووری بچووك، کە گوێی لەدەنگە گڕەکەی گورگەکە بوو، کەمێك ترسا، بەڵام وا بیری کردەوە، کە داپیری ئەنفلۆنزای گرتووە. گوتی: کچەکەتانم، داپیرە، کڵاوسووری بچووك. کولیچەو قاپێکی بچووك پەنیرم بۆهێناون، کە دایکم بۆی ناردوویت».

گورکەکە دەنگی ناسك کردەوەو گوتی:

- دەسکی دەرگاکە ڕاکێشە ئازیزەکەم.

کڵاوسووری بچووك، دەرگاکەی ڕاکێشا، پاشان دەرگاکە کرایەوە.

گورگەکە سەیری کردو گوتی بەکڵاوسووری بچووك:

- کولیچەو قاپە پەنیرەکە لەسەر سندووقەکە دابنێ، ئینجا وەرە بۆلای من؛ با پێکەوە بخەوین.

کڵاوسووری بچووك شتەکانی دانان، پاشان ڕۆشت بۆ ناو جێگاکەی داپیرەی؛ تا پێکەوە بنوون، بەڵام زۆر سەری سوڕما بەبینینی داپیرەی بەو شێوەیە. لەبەرئەوە پرسیی:

"-داپیرە بۆچی دەستەکانت گەورە بوون؟

ئەویش وەڵامی دایەوە:

- بۆئەوەی باشتر بتگرم بەباوەشمەوە، کچم.

- داپیرە بۆچی پێیەکانت وا گەورە بوون؟

- بۆئەوەی بەباشی بتوانم ڕابکەم، ڕۆڵەگیان.

- داپیرە بۆچی گوێیەکانت گەورە بوون؟

- بۆئەوەی باشتر دەنگت ببیستم، ڕۆڵە.

- داپیرە بۆچی چاوەکانت گەورە بوون؟

- بۆئەوەی باشتر تۆ ببینم، کچی شیرینم.

- داپیرە بۆچی ددانەکانت گەورە بوون؟

- بۆئەوەی بەباشی بتوانم تۆ بخۆم».

لەگەڵ ئەم قسەیەدا، گورگی فێڵباز خۆی دا بەسەر کڵاوسووری بچووکداو خواردی.



# ڕێوییە چڵێسەکە

ڕۆژێکیان، ڕێویەک لەناو کلۆری درەختێکدا، بڕێک خۆراکی دۆزییەوە. کە لە لایەن جووتیارێکەوە لەوێدا شاردرابوویەوە. ئەو بڕە خۆراکە، سەرنجی مام ڕێوی ڕاکێشا، لەبەرئەوە هەوڵی دا کە خۆی بچووک بکاتەوە؛ بۆئەوەی هەرچۆنێک بووە، بچێتە ناو کونی درەختەکەوەو خۆی بگەیەنێتە لای خۆراکەکە.

پاشان مام ڕێوی، دوور لە چاوی هەموو کەسێک دەمی خستە ناو

خۆراکەکەو دەستی کرد بە خواردنو خرمەخرمکردنو قوتدانی خۆراکەکە. . هەتا تەواوی کرد!

کاتێك کە هەموو خۆراکەکەی نۆش کرد، ویستی لەناو کلۆری درەختەکە بڕواتە دەرەوە، بەڵام ئەوەی لەبیرکردبوو کاتێك ئەو هاتبوویە ناو ئەم کونەوە، بچووك بووبوو، بەڵام ئێستا بەهۆی پڕخۆرییەوە زۆر قەڵەوو گەورە بووەو هاتنە دەرەوەی لەناو کلۆرییەکەدا، زۆر ئەستەمە! ئەو وا بیری کردەوە، کە درەختەکە خۆی تەسك کردۆتەوە، لەبەر ئەوەیە کە ناتوانێت بێتە دەرەوە. لەبەرئەوە زۆر ترساو سەری لە کونەکە بردە دەرەوەو دەستی کرد بە هاوارکردن: «یارمەتی! یارمەتی! لەم کونە ترسناکە دەرم بهێننەوە!»

ڕێك لەو کاتەدا، بزنەکێویەك بەوێدا تێدەپەڕی، پێیەکی دا بە زەویدا. ڕێوییەکەش پێی زانیو بە کزییەوە هاواری کرد:

- هێی، ئەی بزنە کێوی! یارمەتیم بدە، هەتا بێمە دەرەوە لەم کونەدا! ئەم درەختە لە حاڵی هاتنەوەیەکدایە، خەریکە لەناوم ببات!

بزنەکێوییە زۆرزانەکە دایە قاقای پێکەنینو وەڵامی ڕێوییەکەی دایەوە:

- مەترسە.. سوێندت بۆ دەخۆم، کە ئەم درەختە نەگۆڕراوەو هەروەك خۆیەتی! ئەوە تۆی کە زۆر چەوریت خواردووەو قەڵەو بوویت!

- واز لە گاڵتەکردن بهێنە! تۆ سەیرم بکە، وا خەریکە دەمرم! هەتا زووە یارمەتیم بدە، با لێرە بێمە دەرەوە!

- ئێستاش باوەڕ ناکەیت، کە ئەوە تۆی زۆرت خواردووە؟! درەختەکە هیچی لێ نەهاتووە. تەنها چاوەڕوان بکە! تۆ بە لاوازی چویتە ناو ئەو کونەوە، تەنها بە لاوازیش دەتوانیت لێی بێیتە دەرەوە! هیوادارم کە لە مەودواش کەمتر چڵێسی بکەیت!

ڕێوی هەژار ناچاربوو، بە ڕازیبوون بە قسەکانی بزنە کێوییەکە. دوو شەوو ڕۆژی لەناو ئەو کلۆری دارە بچووکەدا بەسەر برد بە برسێتییەکی زۆرەوە. لەو کاتە بە دواوە بڕیاری دا کە هەرگیز چڵێسیو پڕخۆری نەکات!



# پشیلەو مشکەکە

پشـــیلەو مشکێك پێکەوە لە ئەمبارێکدا، زۆر هاوڕێیانە دەژیان. مشکەکە، عاقڵو دەست پێوەگربوو. بڕیاری دا هەتا هاوینە هەندێك خواردن پاشەکەوت بکەن، بۆ وەرزی سەختی زستان.

ڕۆژێکیـــان پارچەپەنیرێکـــی دۆزییەوە. بە پشـــیلەکەی گوت: «ئەوە هەندێك خواردنە، بۆ وەرزی سەختی زستان! بەڵام لە کوێ بیشارینەوە تادڵنیا بین، کە لێمان نەدزن؟ لێرە لەناو ئەمبارەکەدا، نایشـــارینەوە؛ چونکە خۆمانمان پێ ڕاناگیرێتو پێش ئەوەی کە زستان بێت دەیخۆین.

پشیلەکەش پێشنیاری کرد:

- دەتوانین لەلای دوکەڵکێشی ئاشەکەدا بیشارینەوە.

بەم شێوەیە پەنیرەکە لەوێ شاررایەوە، بەڵام پشیلە چڵێسەکە

نەیتوانی بیری پارچە پەنیرەکە لە مێشکیدا دەربکات. لەبەرئەوە بڕیاری دا، بڕوات بۆلای ئاشەکەو پارچەیەك لە پەنیرەکە بخوات، بـەڵام بۆئەوەی کە مشـکەکە گومانی خراپی لێ نەکات، درۆیەکی درووست کردو گوتی:

«ماڵـی ئامۆزاکـەم، کە لـە نـاو ئەمبارێکی گەنمـدا دەژین، بێچوویەکیان بووەو بانگهێشتیان کردووم بۆ ئاهەنگی ناولێنانەکەی. لەبەرئەوە سبەی دەڕۆم بۆ ئەوێ.

مشکەکەش وەڵامی دایەوە:

- بەخۆشیتان بێت، بەڵام ئەگەر وردەنان مایەوە، لەبیرت بێت بۆم بهێنیتەوە!»

بۆ بەیانییەکەی پشیلەکە ڕۆشت بۆلای ئاشەکە. پارچەپەنیرەکەی لەو شوێنە دەرهێنا کە تێیدا شاردبویانەوەو پارچەیەکی لێ کردەوەو خـواردی. هەر لەوێش خـەوی لێ کەوت؛ تـا دوای خۆرئاوابوون لەوێ مایەوە. ئێوارە ڕۆشتەوە بۆ ئەمبارەکە.

بەبینینی پشـیلەکە، مشـکەکە گوتی: «سەیر بکە، لەو کاتەوەی کـە تۆ ڕۆشـتوویت، من هەموو شـوێنێکم پـاك کردۆتەوە. ئەی خۆشت ڕابورد لە ئاهەنگی ناولێنانەکەدا؟

پشیلەکەش وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، بەڵام هیچم بۆت نەهێناوەتەوە.

مشكەكەش بە نائومێدییەوە گوتی:

- گرنگ نییە. ئەی بێچووەکەتان ناوی چییە؟

- ناوی......، ناوی.......، ناوی «لێوار»ە.

مشكەكە گوتی:

- ناوێکی سەیرە!

دوای تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێك، پشیلەکە بە مشكەكەی گوت: «ماڵی ئامۆزایەکی ترم، کە لە ژێرزەمینێکدا دەژین، بێچوویەکیان بووە. دەبێت سبەی بڕۆم، بۆ ئاهەنگی ناولێنانەکەی.

مشكەكەش وەڵامی دایەوە:

- بەخۆشیتان بێت، بەڵام ئەگەر وردەنان مایەوە، لەبیرت بێت بۆم بهێنیتەوە!»

بۆ بەیانییەکەی پشـیلەکە ڕۆیشـت بۆلای ئاشەکە. ئەمجاریش پارچـە پەنیرەکەی دەرهێناو پارچەیەکی لـێ کردەوەو خواردی. ئێوارە ڕۆشتەوە بۆ ئەمبارەکە.

بە بینیی پشـیلەکە، مشكەكە گوتی: «سەیر بکە، لەو کاتەوەی کە تۆ ڕۆشتوویت من هەموو شوێنێکم پاك کردۆتەوە. ئەی خۆشت ڕابوارد لەئاهەنگی ناو لێنانەکەدا؟

پشیلەکەش وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، بەڵام هیچم بۆت نەهێناوەتەوە.

دووباره مشكەكە بە نائومێدییەوە گوتی:

- گرنگ نییە. ئەی بێچووەكەتان ناوی چییە؟

- ناوی «نیوە»یە.

مشكەكە گوتی:

- ناوێكی سەیرە!

پشیلەكە زۆر هەستی بە تاوانباری دەكرد، بەخواردنی نیوەی پارچە پەنیرەكە بەبێ ئاگاداری مشكەكە، بەڵام حەزەكەشی زۆر بەهێزتربوو بۆ پەنیرەكە. چەند ڕۆژێك دواتر گوتی بە مشكەكە: پوورم كە لە ئاشەكەی ئەولا دەژی، بێچوویەكی بووە. دەبێت سبەی بڕۆم بۆ ئاهەنگی ناولێنانەكەی.

مشكەكەش وەڵامی دایەوە:

- بەخۆشیتان بێت، بەڵام ئەگەر وردەنان مایەوە، لە بیرت بێت، بۆم بهێنیتەوە!»

بۆ بەیانییەكەی پشیلەكە ڕۆیشت بۆلای ئاشەكە. ئەمجار ئەو پارچەپەنیرەی كەمابوویەوە خواردی. ئێوارە ڕۆشتەوە بۆ ئەمبارەكە.

بەبینیی پشیلەكە، مشكەكە گوتی: «سەیر بكە، لەو كاتەوەی كەتۆ ڕۆشتوویت، من هەموو شوێنێكم پاك كردۆتەوە. ئەی خۆشت ڕابوارد لە ئاهەنگی ناو لێنانەكەدا؟

پشیلەکەش وەڵامی دایەوە:

- بەڵێ، بەڵام هیچم بۆت نەهێناوەتەوە.

دیسانەوە مشکەکەش بە نائومێدییەوە گوتی:

- گرنگ نییە. ئەی بێچووەکەتان ناوی چییە؟

- ناوی «هەمووی تەواو»ە.

مشکەکە گوتی:

-ناوێکی سەیرە!

وەرزی زســتان هات بەسەرداو مشکەکە گوتی بە پشیلەکە: «با بڕۆین بۆلای ئاشەکەو پارچەپەنیرەکەمان بهێنینەوە».

پشیلەکەش بەبێئەوەی هیچ بڵێت، ڕۆشت لەگەڵیدا. بەدڵنیاییەوە مشکەکە پارچەپەنیرەکەی نەدۆزییەوە. بەفرمێسك ڕژاندنەوە، بە پشیلەکەی گوت: «خۆ پەنیرەکەیان دزیوین!»

بەڵام پشیلەکە تەنها سەیری مشکەکەی دەکرد. بەوەش مشکەکە تێگەیشــت، کە پەنیرەکە نەدزراوە، بەڵکو پشیلەکە خواردوویەتی. لە بەرئەوە هاواری کرد بەسەر پشیلەکەدا: «ئۆو، تێگەشتم! ئەوە تــۆی کە هەموو پەنیرەکــەت خــواردووە! درۆزن، دز، خراپەکار، خۆپەرست!»

مشــکەکە، هێندە سەرزەنشتی پشــیلەکەی کرد، تا لەئەنجامدا پشیلەکەش تووڕەبوو، خۆی دا بەسەر مشکەکەداو خواردی!



# کچێکی چکۆلە

کچێکــی چکۆلەی دە ســاڵان، قوتابی بوو. ئــەم کچە چکۆلەیە، لەگــەڵ دایکیدا لە ماڵێکی گەورەدا دەژیا. ئەوان پشیلەیەکیشــیان هەبوو.

ڕۆژێکیان، دایکــی کچە چکۆلەکەی بەخەبــەر هێنا؛ بۆئەوەی کــە بڕوات بــۆ قوتابخانە. ئەو ڕۆژەش لەوێ بەفرو ســەرمایەکی

زۆر بـــوو. کچۆڵەکەش زۆر خەوی دەهاتو پێی خۆش نەبوو لەناو جێگا گەرمەکەیدا بێتە دەرەوە. لەبەرئەوە ئەو بەفرو ســـەرمایەی کرد بە بیانوو؛ بۆئـــەوەی کە نەڕوات بۆ قوتابخانەو لەبری ئەوە لەنـــاو جێگا گەرمەکەیـــدا بمێنێتەوەو تێرخەو ببێت. دایکیشـــی هەرچەند کە ســـەرەتا داوای کچەکەی ڕەت کردەوە؛ بەڵام بەهۆی پێداگریی کچۆڵەکەوە، لە کۆتاییدا ڕازی بوو، کە ئەو ڕۆژە نەڕوات بۆ قوتابخانە.

لەو ڕۆژە بەدواوە، کچۆڵەکە بەدایکی گوت: ئیتر نایەوێت بڕوات بـــۆ قوتابخانە؛ چونکە پێـــی خۆش نییە، بەیانیـــان زوو لەخەو هەستێت. دایکیشی لەبەرئەوەی کە پێی خۆش نەبوو، نەیدەویست کچەکـــەی واز لـــە قوتابخانـــە بهێنێت، وەڵامی دایـــەوە کە ئەگەر نەتەوێت بڕۆیت بۆ قوتابخانە، پێویستە لەمەودوا وەکوو پشیلەکە بژیت؛ چونکە پشـــیلەکە ناڕوات بـــۆ قوتابخانە. کچۆڵەکەش ڕازی بوو بە مەرجەکەی دایکی. بەم شێوەیە کچۆڵەکە وازی لە ڕۆشتنە قوتابخانە هێنا..

ڕۆژی دواتر، کچۆڵەکە دوای لەخەوهەســـتانی، ویســـتی شـــتێك بخوات؛ چون هەســـتی بە برســـێتی دەکـــرد. داوای لە دایکی کرد کە شـــتێکی پێ بـــدات؛ تا بیخوات. دایکیشـــی پارچەیەك پەنیری ڤێزەونـــی بۆ هێنا، کە لەناو دەورییەکی پیســـدا بوو. کچۆڵەکە لە

هۆکاری ئەو کارەی دایکی تێنەگەیشت. دایکیشی بۆی ڕوون کردەوە، پشـــیلەکان بەو شێوەیە دەژین؛ چونکە ناڕۆن بۆ قوتابخانە، بەڵام کچۆڵەکە گرنگی بە قسەکانی دایکی نەداو دەستی کرد بە خواردنی پەنیرەکەو دواتریش دەســـتی کرد بە یاریکردن بە بووکەڵەکانی.

ئێوارە دوای نانخواردنو ســـەیرکردنی تەلەفزیۆن، خەوی دەهات. لەبەرئەوە داوای لە دایکی کرد، بیبات بۆ جێگای نووســـتنەکەیو چیرۆکـــی بـــۆ بخوێنێتەوە؛ تـــا خەوی لێ بکەوێـــت، بەڵام دایکی پێی گوت کە تۆ ناتوانیت لە ناو جێگای نووســـتنەکەتدا بنوویت؛ چونکە پشیلەکان لەناو جێگای گەرمو تایبەتی نووستندا نانوون.

کچۆڵەکەش ڕۆشـــت بۆ لای پشیلەکە؛ بۆئەوەی کە لەگەڵ ئەودا بنوێت، بەڵام هەرچەند هەوڵی دا، لە سەرمادا خەوی لێ نەکەوت. هەتـــا لە کۆتاییدا، ناچاربوو بە گریانەوە بڕواتەوە بۆ لای دایکیو پێـــی گوت، کە ئـــەو ناتوانێت وەکوو پشـــیلەکان بژیو ژیان بباتە سەر. لەبەرئەوە دەڕواتەوە بۆ قوتابخانە..

# پێڕست